فەرهەنگی

# مەهاباد

فەرهەنگێکی قوتابخانەیی
کوردی و ئارەوییە

گیوی موکریانی

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

گیوی موکریانی
فەرهەنگی مەهاباد
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٣٤٣
چاپی دووەم ٢٠١٢
تیرێژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٢٨٣٨ - ٢٠١٢
نەخشاندنی ناوەوە و ڕازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: ڕەحیمە عەلی
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، بەدران ئەحمەد حەبیب

ژینک:
ژمارەی پێوانەیی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-9966-488-13-0

## بەکورتی

### مێژووی نووسین و خوێندنی زمانی شیرینی کوردی
### لە نێوانی (٥٠٠٠) ساڵاندا

نەتەوەی کورد وەنەبێ هەمیشە هەروا دواکەوتوو و سەر شۆڕ ژیا بێ، ئەگەر هەروا بایە نەک هەر خۆی لەناو دەچوو بگرە ناو و شوێنەواری پیرۆزی کورد و کوردستانیش لەسەر ڕووپەڕەی مێژوو نەدەمایەوە.

خوا لە قورئانی پیرۆزدا بەو ئایەتەی (سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ) سام و هەیبەت و زەبر و زەنگی کوردان بە گیتی نیشان دەدات وە پێیان هەڵدەڵێ. بەڵگەش ئەوەیە کە زۆرترینی موفەسیرەکان لەسەر ئەوەن کە ئەو هۆزە کوردە. جا نەتەوەیەکی کە خوا بە ئازایی و زەبروزەنگی هەڵبڵێ، دیارە خاوەندی ماڵ و سامان و خوێندن و نووسینیش هەر بووە. چونکو لەسەر ڕووی زەوی کەسێکی وا نەبووە کە لە ترسی وی نەتەوەی کورد نەوێرێ زمان و نیشتمانی خۆی ڕەنێو بهێنێ. کوردستان لەپێش عیسادا نەک تەنیا خاوەندی دەستەڵات و نووسین و خوێندن بووە بە زمانی کوردی و بەس، بگرە لانکی شارستانییەتی و سەرچاوەی زانیاری و پێشکەوتن و هونەر و کانگای پۆشاک و پیشەسازی و بازرگانی بووە وە سەرمەشقی ئازادێتی و پێشکەوتن و هونەرییان بۆ گشت نەتەوەکانی سەر زەوی داداوە.

هەرچەندە بە هۆی درێژایی ڕۆژگار و پشێوی و کارەساتانی گێتییەوە گەلێک لە یادگارە نرخدارەکانی پێشوونیانمان لەناو چوون، سەرەڕای ئەوەش تەختە بەردەکانی بێستوون و تەختی جەمشید و ئەوانەی لە مۆزەخانەکانی هەندەراندا ماونەتەوە، گەورە و گرینگترین بەڵگەن بۆ نیشاندانی شان و شکۆی پێشوونیانمان.

بۆ ئەو ئامانجە پێویستە لەپێشدا خانەوادەی (ماد) و (ساسانی)یان ساخ کەینەوە، کە کورد بوون یا نا، هەتاوەکو ئەستێرەی هیوا ڕووناکتر و ترووسکەدارتر بێ چونکە نووسراوە کۆنەکان بە شێوەی زمانی وان بوون، لە پێش ئیسلام ئەوانەی کە ڕاژەی هونەر

و شارستانێتییان کردبێ تەنیا ماد و ساسانییەکان بوون. لە رووی ئەوەوە کە فارسانیش شانازی هەر بەوانەوە دەکەن و کەسی تریان نییە، پێویستە ساخ کرێتەوە.

## ماد، میدیا.. ئیبن خەلدون دەڵێ ماد و کورد یەکن

حەسەن پیر نیاش لە لاپەڕە ١٦٨ی مێژووی (ئێرانی باستاندا) دەڵێ: مادەکان ئارین و باپیرە گەورەی کوردەکانی ئەمڕۆی موکریانین. زمانی ماد زمانی کوردی موکریی ئەمڕۆکەیە.

لە کتێبی (عشق و سەڵتەنەت) دا نووسراوە: زمانی ماد زمانی کوردییە.

(مەردۆخ) لە مێژووەکەی خۆیدا دەڵێ یەکەمین پادشای ماد لەلای یۆنانییان ناوی (کەیقوباد) و ناوبانگیشی (ئارماس) و کورد بووە.

(دومرگان) دەڵێ: (٢٠٠٠) ساڵ پێش عیسا مادەکان هەبوون و گەلێک جارانیشیان پادشایەتی و شاهەنشایەتییان کردووە بەڵام جەنگەی ناودەرکەوتن و سەربڵندیەتییان لە ٧٠٠ ساڵ پێش عیساوەیە.

(هێرۆدۆت) دەڵێ: دامەزرێنەری شاهەنشایەتیی ماد (فرارتس) بووە و گەلێک کەسیش بە (دیائەکۆ)ی ناودەبەن.

(کیتزیاس)ی مێژوونووسی یۆنانی دەڵێ: ژمارەی پادشایەکانی ماد دە کەس بوون و دوامین پادشایان (ئاستی گاس) بووە و ئەو ئیمپراتۆرییەتە نزیکەی ٣٥٠ ساڵی پتر خایاند.

بە پێی ئەو بەڵگانە دیارە نەتەوەی کورد لەپێش گەلێک نەتەوەکانی گیتیدا وشیار بوونەتەوە و بناغەی خوێندەوارێتی و زانیاری و پیشەسازی و چاندن و ڕاووشکار و پیتۆڵی (فەلسەفە) و ئاوەدانکردنەوە و شارستانیەتی و دەوڵەت و سەڵتەنەتیان دامەزراندووە و پایتەختیشیان شاری ئەکباتان (هەمەدان)ێ بووە.

## نەژادی ساسانییان

ئیمپراتۆریەتی ساسانییان (٤٠٠) ساڵ پێش ئیسلام دامەزراوە و ڕاژە (خدمەت)ی شارستانیەتی و زانیاری و پیشەسازی و بازرگانی و لەش ساخێتییان کردووە.

دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ساسانی (ئەردەشێر)ی کوڕی (بابک)ە کوردە و لە تیرەی

شوانکارەیە و دایکیشی ناوی (پاپک)ە کچی یەکێکە لە هۆزەکانی بازرنگی کورد، دەڵێن (٨٨٠) ساڵان ژیاوە بەڵان (٢٥) ساڵانی پادشایەتی کردووە، پادشای هەرە دواییش ناوی (یەزدیی کورد) بووە و (٢٠) ساڵانی پادشایەتیی کردووە.

لەناو زنجیرەی ساسانییاندا (٢٩) کەس پادشایەتییان کردووە و پایتەختیشیان (مەدائین) بووە کە لە پێشدا (مادایان)یان پێ کوتووە و ٢٩ فرسەنگ لە شاری بەغدایە دوورە.

(کۆلۆنێل دوهووسە) لە ١٨٦٣دا کوتوویە: سەر و ماسوولکەی بەهێز و مووی ڕەش و برۆی پانی کوردان سکەی ساسانییانم وەبیر دێنێتەوە. (طبري) دەڵێ: ئەردەشێر کوڕی بابەک کوڕی ساسان کوڕی بابەکی زرارییە (یاقوت و معجم البلدان) دەڵێن ساسانییەکان بە یادگاریی نەتەوەی خۆیان شارێکیان لە (مەدائین)ێ ناو نا (کورد ئاوا).

(ئسترابۆن) دەڵێ کە ئەردەشێر بەسەر فارساندا زاڵ بوو ناوی خۆی نا (شاهەنشا) دیارە کورد بووە چونکو مرۆ تا نەتەوەیەکی بێگانەی نەکەوێتە ژێر دەستییەوە نابێتە شاهەنشا.

مێژووی مووسڵ دەڵێ: ئەردەشێر بە پشتیوانی و یاریکاریی مادەکان توانی دەوڵەتی ساسانییان دامەزرێنێ.

ئەردەشێر (سێ) جاران لەگەڵ ئەردەوانی پادشای هەرە دواییی هەخامەنشییەکانی شەڕ کردووە کە فارس بووە.

تەبەری لە بەرگی (١) و لە لاپەڕە (٤٧٨)دا بەو جوورەی نووسیوە:

لە شەڕی دووەمیندا ئەردەوان وا شکا کە خۆی پێ نەگیرێتەوە نامەیەکی بەو شێوەیە بۆ ئەردەشێری نووسی: (إنك قد عدوت طورك وأجتلبت حتفك أيها الكردي المربي في خيام الأكراد من أذن لك في التاج التي لبسته والبلاد التي أحتويت عليها وغلبت ملوكها وأهلها ومن أمرك ببناء المدينة التي أسستها (في الصحراء)؟

واتاکەی: تۆ پێت لە ئەندازەی بەرەی خۆت تێ پەڕاندووە وا دیارە ئەجەلت هاتووە ئەی ئەو کوردەی کە لەناو خێوەتی کورداندا پەروەردە کراوی بە دەستووری کێ تاجت لەسەر ناوە و ئەو وڵاتانەت گرتووە؟ و بەسەر پاشا و دانیشتووەکانیاندا زاڵ بووی؟ و بە فەرمانی کێ لەو دەشتەیدا ئەو شارەت دامەزراندووە؟

# نووسین و خوێندن بە زمانی کوردی لە پێش عیساوە تا ئەمڕۆ

(تنگ گەلوو) کە ناوبانگی (شەنگوڵ) بووە کوردێکی زانا و وێژەوانی جزیرێ بووە لە نێو چیاکانی باکوری مووسڵ (٧٠٠) ساڵ لەپێش عیسادا پەڕتووک (کتێب)ی بەزمانی کوردی لەبابەت ئاین و ئەستێرەناسییەوە داناوە. (ئاریاتە) کە کوردێکی پزیشک و زانا و داهێنەرێکی بەناوبانگ بووە لە ٦٨٨ی پێش عیسایەدا پەڕتووکێکی مەزنی لە هونەری پزیشکیدا بە زمانی کوردی داناوە و بە ئەلفوبێی کوردی نووسیوەتەوە.

حەسەن پیرنیا لە مێژووی ئێرانی باستاندا دەڵێ:

زەردەشت دوو کتێبی هەبوو (١) ئاوێستا. (٢) دین کورد.

دین کورد لەسەر پێستی (١٢٠٠٠) گامێشان نووسراوەتەوە.

(ئازەر بود مارسوپەند) لە خەتی پەهلەوییەوە ئەلفوبێیەکی داهێنا (٤٢) نیشانە بوو کە بۆ پارێزگاریی هەموو جوورە دەنگێکی زۆر لەبار بوو.

وە سەر و بۆر و ژێر (اعراب)ی بە پیت بوو، (ئاوێستا)شی بەوی نووسییەوە ناوی نا زەند و بە خەتەکەشی دەکوت خەتی زەند.

نموونەی خەت و ئەلفوبێی کوردی (٢٨٠٠) ساڵ پێش عیسا



لاپەڕەیەکی ئاوێستایە و لە پەڕتووکی کێگر و کوهن وەرگیراوە

کۆنترین پەرتووکی کوردی ناوی (دین کورد)ە بە زمانی پەهلەوی بووە کە زمانی لوڕ و کەلهوڕ و شوانانە.

(ئازەر بود) لە پاش پەیدابوونی ئیسلام دەڵێ: من کە ئازەر بودی کوڕی هەمەد و پێشەوای بادینانم، پەرتووکی (دین کورد)م لەو قاقەزە دڕاوانە کۆ کردەوە و بە یاریکاریی خوا دووبارە هەموویانم نووسینەوە.

(هیرۆدۆت) دەڵێ: بیانەکۆ دامەزرێنەری زنجیرەی پادشایەتیی ماد لە پێش دادپەرستیی (محاکمە)دا سکالا (عرضحال)ی دەخوێندەوە.

(کونتزیاس)ی یۆنانی کە پزشکی دەرباری ئەردەشێری بابەکان بووە پەرتووکێکی مێژوویی نووسیوەتەوە و لە ڕۆژنامەکانی دەرباری شاهانە دەدوێت.

(کەزنەفۆن) لە پەرتووکەکەی خۆیدا کە ناوی پەروەردەکردنی (کوڕوش)ە باسی قوتابخانە و خوێندنی دەکات.

(ئەفلاتوونی) پزشک و (پلووتارک) و چەند مێژوو نووسێکی تریش لەو بابەتەوە زۆر چتیان نووسیوە.

ئەو تەوراتەی کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا نووسراوەتەوە باسی یاسا (قانون) و خوێندن و نووسینی ئیمپەراتۆریەتی مادەکان دەکا. لەوانەڕا وا دیارە کە لە کوردستاندا نووسین و خوێندن و سکالا و ڕۆژنامە و دادگا و دادپرسین هەبووە.

هەڵبەست و هۆنراوانی کوردی لە پێش ئیسلامدا: زۆرترین ئاوێستا و دینکورد بە هەڵبەست بووە و بە دەنگی خۆش و بڵند خوێندراونەتەوە.

(باربود) لە دەرباری ساسانییاندا بە دەنگ و ئاوازە خۆشەکەی خۆی هەڵبەست و هۆنراوەوەی بەدەم ساز و سەمتوورانەوە دەخوێندەوە.

## پەرتووک (کتێب)ە کوردییەکانی پێش ئیسلام:

لە پێش ئیسلامدا پەرتووک و نووسراو بە زمان و ئەلفوبێی کوردی ئەوەندە زۆر بووە نایەنە ئەژمارەوە. مێژوو دەڵێ کە موسڵمانان هێرشیان هێنا سەر کوردستان هێندەیان نامە و نامیلکە و پەرتووکانی مەجووس و زەردەشتییان لە نێو زێیە ئاوێژت کە پێشی زێیە گیرا.

پەرتووک و نووسراوەکانی پێش ئیسلام دەکرێنە دوو بەش:

بەشێکی ئاینی بوون لەبابەت ئاینی مەهابادییانەوە و ئاوێستا و زەند و دین کورد و هتدیش لەبابەت زەردەشتییەوەن.

بەشەکەی تریش لەبابەت کەمۆیی (سیاسەت) و خوورەشت و لەش ساخێتی و زانیاری و وێژەیی و مێژوویی و پیشەسازی و ئەفسانە و چیرۆک و دەوڵەتگێری و هێندێکیش لەمەڕ دەستووری گەمەی شەترنج و سوارچاکی و تیر ئاوێژی و کشتوکاڵ و دارودرەخت و زەوی و ئەستێرەناسی و پیتۆڵییەوە بوون.

ناوی هێندێک لە پەڕتووکە کۆنەکانی پێش ئیسلام و عیسا ئەوانەن:

ئاوێستا، دین کورد، بوندهسن، داتستان دینیک، ئارتای، وێراڤنامە، کارنامەی ئەردەشێری بابەکان، پاتکار، زرێران، داتستان ریدک، خوسرەو، گوواتان، وشترەنگنامە، خوتای نامە، خووای نامەو ڕۆستەم نامە، هتد...

پێویستە ئەوەش بزانرێ کە خوتای نامە بەناوی (سیرالملوکی) و خووای نامە بەناوی شانامە لە زاراوەی پەهلەوییەوە وەرگێڕرانە سەر فارسی و ئارەویی. کلیلە و دەمەنەش لە سەردەمی نەوشیرەوانی کوردی دادگەردا لە هیندوستانەوە هاتە کوردستان و کرا بە پەهلەوی وە لە دوای پەیدابوونی ئیسلامانیشدا لە پەهلەوییەوە کرا بە فارسی. شانامە و پەڕتووکە مێژووییەکانی پێش ئیسلام لە زمانی پەهلەوییەوە کراونەتە فارسی.

ئەو نامیلکە و پەڕتووکانەی کە لە سەردەمی ئیسلاماندا بە زمانی فارسی پەیدا بوون سەرپاکیان لە یادگارەکانی دەورەی ساسانییەکانەوە لە کوردییەوە وەرگێڕراونەتە سەر فارسی، ئەوانەی خوارەوەن:

وامق و عذرا، وەیسی و رامیتی، ئەسکەندەر نامە، یووراسپ، پلوهر، شیرین و فەرهاد، خەسرەو و شیرین، بارام نامە، گرشاسپ نامە، بهمن نامە، ڕۆستەم نامە، شهریار نامە، جهانگیر نامە، فەرامەرز نامە، برزوو نامە، بەختیار نامە، هەزار ئەفسانە، (ئەلف لێلە و لێلە). داستانی سندباد و هەزارانی تر لەزمانی پەهلەوییەوە کراونە فارسی.

## زمانی پەهلەوی

بە پێی گەلێک سەرچاوەکانی مێژوویی وا دەرکەوت کە نووسین و خوێندن و پەڕتووک و ڕۆژنامە لەپێش ئیسلامدا لەناو کورداندا بە زمانی پەهلەوی بووە و ئاشکراش بووە کە زمانی پەهلەوی زمانی فارسی نییە. کەوابوو پێویستە سەرنج بدەینە ئەوەی کە ئایا زمانی

پەهلەوی بەندیواریی بەسەر زمانی کوردییەوە هەیە یا نا؟

مامۆستا سەعید نەفیسی دەڵێ ئەو زمانەی کە ئاوێستای پێ نووسراوەتەوە شێوەیەکی ئارییە و لە ئێرانێدا زۆر لە مێژەوە بەکار براوە لەپێش ئەوەدا کە باپیرە گەورەکانی فارسان بێنە ئێرانی. کاتێکی ئاوێستایان بەو شێوەیە نووسییەوە ناویان نا زمانی ئاوێستا.

زمانی ئاوێستا لە سەردەمی ساسانییەکاندا زمانێکی میری (رەسمی) بووە و ئێستاش بەشێکی زۆر لە زمانەکانی خۆجێیی (محلي) و ناوچەکانی ئێرانیدا لەزمانی پەهلەوی دەچن دیارە زمانەکانی ئێرانی کە فارسی نەبێ کوردییە.

دوکتۆر (رضازادە شفق) لە مێژووی ئەدەبیاتی فارسیدا لە لاپەڕە (٢٥)دا نووسیویە کە (شێوەی زمانی ئاوێستا لە باکوری ئێرانیدا برەوی هەیە کە دیارە کوردستانە.

مامۆستا شێخ محەمەدی (آیت اللّه) لە مێژووی مەردوخ لە لاپەڕە ٤١دا دەڵێ: زەند ئاوێستا هەروەکو بە زمانی مادی نووسراوەتەوە زۆر لە زاراوەی موکری دەچێ وەیا دەق شێوەی موکریی هەیە.

ئەو بیروباوەڕە لەلایەن (هوارت و درستتر) و چەندین پسپۆڕانی زمانییەوە قۆڵی بۆ کێشراوە کە زمانی ئاوێستای زەردەشتی زمانی کوردیی مادییە.

(ملک الکلامی) دەڵێ: دە بەش لە هەڵبەستەکانی پەهلەوی کە ئێستا تەرک کراون کرمانجی و کوردییە.

ئەو وشانەی کە بە تایبەتی دەڵێن ئی پەهلەویانن ئەوانەن: (سەرا، سەردار، سوپا، فەرمان، سەرهەنگ، سەرتیپ... هتد) ئەو وشانەی سەرەوە بە بێ کەم و کوڕی کوردین و ئێستاش لە کوردستانیدا بەکار دەبرێن.

پەهلەوی نەتەوە (میللەت) نەبووە واتاکەی شارستانییە و بەتایبەتی بۆ سەردار و فەرمانڕەوا و پادشایەکانی ساسانییان بەکاربراوە کە سەرۆکی وان ئەردەشێری پەهلەوییە و دامەزرێنەریی بنچینەی شاهەنشایەتیی ساسانییان بووە.

## ساڵنامە و تەقویم و مێژووی ساڵی ئاوێستا

لە کوردستانیدا ساڵنامە و تەقویمی ساڵی ئاوێستا هەبووە و هەموو ساڵێکیش تازە کراوەتەوە هەر کەسێکی ئارەزووی هەیە کە لەو لایەنانەوە شارەزایییێکی تەواو و پوختی دەست کەوێ ئاوڕێک لە ژمارە (٩ ـ ١٠ ـ ١١ ـ ١٢ ـ ١٣)ی کۆواری (هەتاو) بداتەوە.

ئەلفوبێی کوردی پێش ئیسلام



کە تا دواڕۆژگاری خەلیفەکانی ئەمەوی و عەباسی لە کوردستانیدا بەکار براوە.

ئەحمەد کوڕی وحشییەی نەبەتی لە یادگارەکەی خۆیدا کە ناوی (شوق المستهام في معرفة رموز الأقلام)ە کە لە (٢٤١)ی هجریدا نووسیویەتەوە لە بابەت ئەو ئەلفوبێ کوردییەی سەرەوەدا دەڵێ:

لە بەغدایە لە (ناووسی)دا چاوم بە (٣٠) بەرگە کتێبی کوردی کەوتووە کە بەو پیتە کوردییانە نووسراونەتەوە.

ئێستاش لە شامێ دوو بەرگم لەوانە لە لایە یەکێکیان باسی پەروەردەکردن و چەقاندنی دارە خورمایان و ئیتر دەکات، ئەوی تریشیان لە بابەت دۆزینەوەی ئاوێیە لە جێگایانی وشک و بێ ئاودا، دەڵێ: ئەوانەم وەرگێڕانە سەر زمانی ئارەوی (عەرەبی) تا ئادەمیزاد سوود و کەڵکیان لێ وەرگرن.

ئەحمەد نەبەتی دەڵێ: ئەو ئەلفوبێیە لە دوای پێکگرتن (تطبیق)ی تەواوی پیتەکانی (ئەبجەدی) لە (ئەلفەوە) تا (خ) چەند پیتێکی تریشی تێدایە لە دەستووری حروفان پترە، پیتی (پ، خ)یشی لێ جوایەز کراوەتەوە کەچی هێشتا حەوت جۆرە پیتی تریشیان هەیە کە بەهیچ زمانێکی وەرناگێڕرێن و دەنگیان لەنێو هیچ ئەلفوبێیەکی تردا نییە و بۆ ئەو شەش پیتانە هیچ دەنگ و وێنەیەکمان لەناو هیچ ئەلفبایەک و زمان و قەڵەمێکی دیکەدا بۆ نەدۆزراوەتەوە، دیارە دەنگ و هەست و خوستێکی زۆر سەیریان هەیە، هەر بە هۆی ئەو (مخرج) و پیتانەوەیە کە کرککردن (تلفظ) و خوێندنەوەی هەموو زمانێکی بۆ کوردان ئاسانە و هەتا قورئانیش وەکو عەرەبێکی بەدەوی دەخوێننەوە بگرە باشتری کرک (تلفظ) پێ دەکەن: گەلێک لوغەت لە ڕەگ و ڕیشەدا کوردین عەرەبان لە کوردانیان وەرگرتووە و بەکاری دەبەن لە بارێکیدا کە ڕەگ و ڕیشەیان تەنیا لە زمانی کوردیدا دەدۆزرێنەوە و عەرەبی نین.

## نووسین و خوێندنی کوردی و پەڕتووکەکانی کوردیی دوای پەیدابوونی ئیسلام

زمان و ئەلفوبێی کوردیی تا سەردەمی حەجاجی یوسفی بەبێ پسانەوە بەکار هەر براوە. سەعید نەفیسی دەڵێ: گەلێک لەو پەڕتووکانەی کە بە زمانی ئاوێستان تا ٦٠٠ی هجری کەم و زۆرێک بەدزی و بە ئاشکرا بەکار هەر براون هەزاران زانای وەکو بابا تاهیری هەمەدانی و ئەبو موسلیمی خوراسانییان لێ هەڵکەوتووە.

## هۆی پسانی زمانی کوردی تا چەند سەدەیەکی

تا دوایی عەباسییەکان کە زمانی نووسین و خوێندن لە کوردستاندا کوردی بوو، لەوە بەولاوە لە سایەی مەلا و شێخە بێگانە پەرستەکان و چەند کوردێکی ناپاک و دڵڕەشەوە رووناکیی چرای زمانی کوردی رووی لە خامۆشی کرد.

لە چاخی عەبدولەلیک کوڕی مەڕوانی ئەمەویدا لە هەموو کوردستانیدا زمانی دەوڵەتی لە دائرەکان و قوتابخانە و مزگەوتاندا کوردی بووە هەرچەندە تەواوی دەفتەر و کاروباری دەوڵەت و مووچەخۆرەکان لە بەردەستی عەرەبان بوو بەڵان دانیشتوانی هەموو وڵاتێکی کتێبی قانوون و دەفتەرەکانی دیوانی و نووسین و کاروباری دەوڵەتی بەزمان و خەتی وڵاتەکەی خۆیان بوو. کوردەکانیش وەکو میسر و شامێ تەنیا زمان و خەتی کوردییان لە کوردستاندا بەکار دەبرد، دیوان و دەفتەرداری عێراقی بە تەواوی لەژێر دەستی کورداندا بوو وە زمانی ڕەسمی تەنیا کوردی بوو. لە چاخی حەجاجیدا تەواوی دیوانەکانی میری لەژێر چاودێری کوردێکیدا بوو کە ناوی (زادان فەڕوخ) بوو ژێردەستی نووسەرەکانیش ناوی ساڵح کوڕی عەبدوڕەحمان بوو کە موسڵمانان باوکی وییان لەلایەکی ترەوەی کوردستانەوە بە دیلی هێنابوو.

لە رووی ئەوەوە کە ساڵح لەلای حەجاجی رێز و قەدری نەدەگیرا و پێشی شەرم بوو کە لەژێر دەستی زادان فەڕوخیدا بژی دەماری توند بوو، ڕۆژێکی بە زادانی گوت: ئەمیر بۆیە رێزم ناگرێت چونکو بەهۆی تۆوەم دەناسی و ناشمەوێ بگەمە پایەیەکی لە تۆ بەرزتر و وەپێش تۆ بکەوم. (زادان فەڕوخ) گوتی: دڵی خۆت بە چتی وا سەخڵەت مەکە ئەوەندەش بزانە کە ئەمیر بە من ئاتاجترە تا من بەو چونکو لەمن بەدەر کەسێکی تری دەست ناکەوێت کە هەموو ئاکارێکی دیوانی پێ هەڵبسوورێ. ساڵح گوتی: من دەتوانم هەمووی هەڵبسووڕێنم و ئەگەر حەز دەکەی دەتوانم هەمووشی وەربگێڕمە سەر زمانی ئارەوییەوە.

زادان کوتی: دا چەند دێریکی بکە. سالّح دەمودەست کردییە ئارەوی. زادان زۆر لە دڵی گران هات و کوتی: دەک پەنجەت هەڵوەرێ و قەدەغەی لێ کرد کە جارێکی تر چتی وا ناکات.

بەڵان داخەکەم شۆفاران ئەو مشتومڕەیان بە گوێی حەجاجی دادا ئیتر سەبارەت بە تێکدانی زمانی کوردی (زادان فەڕوخ) یان لە هەرایەکەی (ابن اشعث)دا بە کوژتن دا. حەجاج سالّحی لە شوێنی وی دانا وەت کای لێ کرد کە هەموو دەفتەر و کاروباری دەوڵەتی لە کوردییەوە بگۆڕێتە سەر ئارەوی.

مەردانشا کوڕی زادان فەڕوخی چووە لای سالّحی زۆری لەبەر پاڕاوە هەولّی دا کە پێش بەو ئاکارە بگرێ و پەشێمانی کاتەوە نەیتوانی، کە ناهومێد بوو بە سالّحی هەڵکالاو کوتی: خودا ڕیشەت لە دونیایەدا هەڵکەنێ و پەنجەکانت هەڵومرێنێ هەر وەکو زمانی کوردیت لە ڕەگ و پووکەوە دەرهێنا.

ئیتر لە هەموو شوێنێکەوە کوردە کوردپەروەر و کوردستان پەرستەکان هوروژمیان بە هەموو چەشنێکی بردە سەری بێ سوود بوو، زێڕینگەرێکی سەردەشتی چووە لای سالّحی و پێی کوت: بە حەجاجی بڵێ پێم ناکرێ هێندەی حەجاج لە نێوانی (٢٠) سالّانتدا دەداتێ من سەد هێندەت هەر زێڕ دەدەمێ و ئێستا پێشەکیش باتمانێکت زێڕی بێ خلّتە دەدەمێ کە خەزێنەی حەجاجی نیو هێندەشی تێدا نییە سوودی نەبوو.

تا ئەودەمی پارەی ئیسلامانیش لە وڵاتی کوردستانیدا هەر بە زمان و خەتی کوردی بوون ئەویش لەناو چوو وە هەرچێکی کوردزمانیش بوو کەم کەمە بەبێ تاوان لە کاروباری دەوڵەتی دەرکران. لەو ڕۆژە رەشەوە تا دواییی خەلیفەکانی عەباسی کەم کەمە بە دزی نووسین و خوێندن بە زمان و ئەلفوبێی کوردی کۆن هەر مابوو وەکو ئەو نامیلکە و پەڕتووکانە: ئاوێستا، زەند، بازەند، زەند ئاوێستا، دینی کورد، دیوانی بابا تاهیری هەمەدانی، ڕۆستەمنامە، شیرین و فەرهاد، شیرین و خەسرەو، حەوت خوانی ڕۆستەم، جیهانگیر و ڕۆستەم، خاوەران، بەهنەسا... هتد. کە زۆرتریان بە هەڵبەست بوون وە لەو سەردەمیدا بە پیتی ئارەوییان نووسینەوە تا بمێنن چاو و ڕاوی مەلا و شێخە بێگانە پەرستەکانمان گەیشتە رادەیەکی وا کە هەر کەسێکی نامیلکەیەکی مەجووسی و زەردەشتییان یانی (کوردی) بسووتێنی هەزاران قەسر و حۆریی دەدرێتێ. بەو هۆیانەوە چرای زمانی شیرینی کوردی تا چەند سەدەیەکی خامۆش بوو.

بەڵان تاک تاکە بوێژەکانمان هەڵبەستیان بە کوردی هەر دادەنا. لە سەدەی (١٧)میندا خانی مەم و زین و نەوبەهاری بچووکان و مەولود نامە و عەقیدا ئیمانی بە زمانی کوردی داناوە.

(الهدية الحميدية في اللغة الكردية) لە لایەن خالدی یوسف زیائەدین پاشاوە لە (١٧٩٤)دا دانراوە و لە ئەستەمبوڵێ چاپ کراوە.

گراماتیکا گارسۆنی کە فەرهەنگی کوردی ئیتاڵییە و لە ١٧٧٧دا لە ڕۆما چاپ کراوە. لە دوای گارسۆنی تا نیوەی سەدەی (١٩) چەند نامە و نامیلکە و فەرهەنگی گچکە بە زمانی کوردی دروست کراون وەکو هینەکەی (ڕیچ) و هەڵبەستی چەند بوێژێکی کوردی و چەند نامیلکەیەکی وەژەگ (نثر) کە ئێستاش ماون.

لە ساڵانی (١٨٥٦، ١٨٥٧ و ١٨٥٨)دا سێ فەرهەنگ و نامیلکەی وێژەییی کوردی بە زاراوەی کرمانجی لە (پێتر بۆرگێ) چاپ کراون.

لە ساڵی ١٨٦٠دا (ئەی. ژابا) چەند وتارێکی لەبابەت وێژە و مێژوو و زمانی کوردییەوە داناوە و بڵاوی کردەوە.

ئەی. ژابا فەرهەنگانی کوردی ـ فەرەنسایی، فەرەنسایی و رووسی، کوردی و کوردی، فرەنسایی و کوردی، کوردی و رووسیی دانابوو.

لەو خەباتەدا مەلای بایەزیدی و ئەحمەدی خانی یاریکاریی (ژابا)یان کردبوو فەرهەنگە دەستنووسەکانی (ژابا) چاپ نەکرابوون و لە ئارخێڤا زانینگای لێنینگرادێدان بەڵان ئەوی کوردی و فەرەنساییەکەی زانینگا لە ١٨٦٧دا چاپی کرد، فەرهەنگەکەی کوردی و زمانی بیانییان زۆر مەزنە ٤٦٦ بەڵگە و ١٥٠٠٠ وشەی کرمانجییە هی سۆرانی زۆر کەم تێدایە وشەکانی بە پیتی ئارەوی و لاتینی نووسراون بەرانبەری وان فارسی و ئارەوی و هەرمەنی*.

ئیتر لەوساوە تا ئەمڕۆ چەند سەد پەڕاوی و هەزاران هەڵبەستی کوردیمان هەیە بۆ ئەو مەبەستە چاوێک بە مێژووی وێژەی کوردیدا بخشێنن کە خوا یاربێ لە (١٢) بەرگاندا لەمەو دوا چاپ دەکرێ.

---

* بەشێکی ئەو لاپەڕەیەم لە وتارەکەی مامۆستا قەناتی کوردۆ وەرگرتووە کە ڕۆناهی بڵاوی کردبووەوە.

# پێشەکی

برسی هەزار ساڵان ئاو و چا و کژ و گیایان بخوا هێندەی پاروەوە نانێکی وە یا خۆراکێکی بەتین هێزی وەبەر نایەتەوە و پێشی مەرگی ناگرێت. بۆ هەموو نەتەوەیەکی، پارێزگاریی زمانی تایبەتی خۆی لە ژوورووی هەموو پێداویستییەکیدایە. زمان یادگاری پێشوونیانە و ئاوێنەی بەسەرهات و کارەساتانی مێژووییە، هەر لە توانای زماندایە کە سەردەمی رابردوو لە دوارۆژ گرێ بداتەوە. چۆن هیچ گیانلەبەرێک بەبێ ئاو و زاد ناژی هەر بەو چەشنە هیچ نەتەوەیەکیش بەبێ زمان زیندەگانیی پێ ناکرێت. هەر نەتەوەیەکی زمانی زیندوو نەبێ خۆشی لە ریزەی مردووانە، نموونەی پێشکەوتن و دواکەوتنی هەموو هۆزێکی تەنیا لە ئاوێنەی زمانەکەیدا ئەندام دەنوێنێ. شوێنەواری وێژەیی بۆ هەموو گەلێکی گەورەترین پشتیوان و یاریکاریەتی. مرۆ بە زمانی زکماکی خۆی نەبێ گفتوگۆی دەروونی دانامرکێ هەموو گەلێک گەورەترین هۆی جیاوازیی لە بێگانان زمانەکەی خۆیەتی چونکو زمان دەنگی هەستێکی خۆپسکی وایە هەموو مرۆیەکی لە بیانیسان هەڵداوێرێ. نەتەوەی بێ زمان وەکو وڵاخێکی بەستەزمان وایە کە لەسەرەوەی بار و سەربارەکەشییەوە سواری دەبن.

نەتەوەی خاوەند زمان و وێژە کەمتر تووشی نەهاتی و نەگبەتییان دێت کە تووشیش بێت زۆر زوو رزگاریی دێت، گەورەترین پشتیوان و یاریکاری گەلی کەوتوو و لێقەوماو تەنیا زمان و وێژەکەیەتی کە لە هەموو تەنگانەیەکیدا فریای دەکەوێ.

هۆزێکی خاوەندی زمان و وێژە بێ ئەگەر سەرای دەستەلاتیشی لێ برمێ کەمترین تەکانێکی بداتە خۆی سەرای سەردارێتیی خۆی لە جاران باشتر و خۆشتری بۆ دادەمەزرێتەوە چونکو زمان و وێژەکەی هۆی یەکەتی و پشتی یەکتر گرتن و چارەسازییان بۆ دەرەخسێنی وە سیپاڵی دواکەوتن و دیلی توور هەڵدەدات.

یۆنانییان کە چەند سەدەیەکی کەوتبوونە ژێر دەستی عوسمانییە ناپاک و

جانەوەرەکانەوە، زمان و وێژەی یۆنانییەکان لە ئەورووپایدا دەستە و لایەنگیری بۆ پەیداکردن تا ئازاد کران. ئێرانییەکانیش کە چەند سەدەیەکی کەوتبوونە ژێر دەستی تورکە ڕەشەکانی قاجارانەوە تەنیا وێژە و زمانی فارسی ئەوانی ڕزگار کرد.

تات (ئارەو)انیش کە چەند سەدەیەکی کەوتبوونە ژێردەستی تورکە جانەوەر و خوێنخۆرەکانەوە، تەنیا وێژە و زمانی ئارەوی ئەوانی ڕزگار کرد و خۆم دیتوومە کە چۆن تۆڵەی خۆشیان لێ کردنەوە. کەوایە ژیان و ئابڕووی هەموو نەتەوەیەکی، بەندیواریی هەیە بە زمانەکەیەوە. نەتەوەی خاوەند زمان نامرێ، مەرگی ڕاستەقینە ڕوو لە نەتەوەیەکی دەکات، کە لە بەهرەی زمانی خۆی بەشبڕاو بێ. هەر هۆزێکی بکەوێتە ژێر دەستی بێگانانەوە سەربەخۆیەتی دەدۆڕێنی بەڵان دەستی لە ژیان بەر نابێ. ژیانی ئابڕوومەندانە بۆ نەتەوەی دیل تەنیا پارێزگاریی زمانەکەیەتی چونکو زمانی نەتەوەیی دیل کلیلی گرتووخانەیە. بەو هۆیەوە ڕزگاربوونی زۆر ئاسانە بەڵان کە هات و خودای نەخوازتە دەستی لە پارێزگاریی زمانەکەی خۆی شل بێ هەروەکو ئازادیتیی لە دەست چووە پەردەی نامووسی نەتەوایەتیشی ونجڕبەونجڕ دەبێ.

هەر نەتەوەیەکی زمانەکەی ڕوو لە بووژانەوە بکات ئەستێرەی ئاوات و بەختیشی سەر لە ئاسۆ دەردەهێنی. هەر گەلێکی بە زمانەکەی خۆی ڕێگای زانست و هونەر بگرێتە پێش، بە هەموو ئاوات و ئامانجێکی خۆی دەگات. نەتەوەیەک بەختیار و کامرانە و وڵاتێک ڕوو لە هات و شارستانێتی و ئاوەدانییە، کە شارێگای بووژانەوە و پێشکەوتنی بە چرای زانست و هونەرێک ڕەوشەن بکرێتەوە، کە بە زمانی زگماکی خۆی هەڵبسووڕێ. هۆزێک بە بەختیار دەژمێررێت کە ڕابەر و پێشەوایانی خوێندەوار و هونەرپەرست بن بەو مەرجە کە زمانی وێژە (ادب)ی بە زمانی زگماکی خۆیان بێت چونکە ئەگەر خوێندەواری تەنیا بە زمانی بیانییان بێ، هەمیشە لای بێگانەپەرستێتی بەهێزتر دەبێ. تا ئێستا هەزاران زانا و پسپۆڕ و بووێژ و وێژەوانانی وامان لێ هەڵکەوتووە کە لەسەر زەوی هاوتایان کەم بووبێ بەڵان لە ڕووی ئەوەوە، کە خوێندەوارییان بە زمانی بێگانان بووە و هەر خزمەتی وانیشیان کردووە، ئێستا هەر شووێنەواریشیان لەناو کوردایەتیدا نەماوە و ناناسرێنەوە چونکو یا شوێنبڕ بوون وەیا کڵاوی بێگانانیان لەسەر نراوە. منیش بەهۆی ئەو بیر وباوەڕانەوە وە سەبارەت بەوەی کە نەتەوەی کوردیش فەرهەنگ و مێژوو و وێژەی هەبێ، لە نێوانی خەباتێکی بێ پسانەوەی ٥٠ ساڵانەدا ئەو چەند پەڕتووک (کتێب)انەی خووارەوەم پێکەوە ناون:

١ـ فەرهەنگی کوردستان کە چوار بەرگە و نزیکەی (٤٥) هەزار وشەی کوردیی پەتیی کۆن و تازەی هەموو لایەکی کوردستانە و لە کوردییەوە بۆ کوردییە و بە (١٣٠٠) وێنانیش رازاوەتەوە داخەکەم هێشتا چاپ نەکراوە.

٢ـ فەرهەنگی ڕابەر (المرشد) کە لە ئارەوییە بۆ کوردییە و (٤٠٠) لاپەڕەیە و لە (١٩٥٠)دا لە هەولێر لە چاپخانەی کوردستاندا چاپ کراوە.

٣ـ کۆلکەزێڕینە لە کوردییەوە بۆ فارسی، ئارەوی، فرانسەیی و ئینگلیزییە لە (١٩٥٥)دا لە هەولێر لە چاپخانەی کوردستاندا چاپ کراوە.

٤ـ فەرهەنگی مەهاباد کە لە کوردییەوە بۆ ئارەوییە و نزیکی (٨٠٠) لاپەڕە و (٣٠٠٠٠) وشەی کوردیی پەتییە لە (١٩٦١)دا لە هەولێر لە چاپخانەی کوردستاندا چاپ کراوە.

٥ـ دوازدە بەرگ مێژووی وێژەیی (تاریخی أدبی) کە لە پێش (٥٠٠٠) ساڵەوە خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی و پەرتووکە کوردییەکانی چەند هەزار ساڵ لەوەپێش و ناوی بەسەرهات و هەڵبەستی (٣٠٠٠) بوێژانی کۆن و تازە بە وێنەی (٣٠٠) کەسێکیانەوەی تێدا تۆمار کراوە. داخەکەم ئەو دوازدە بەرگانەش هێشتا چاپ نەکراون.

***

ئایا ئەو یادگارانەی سەرەوەم چۆن بۆ پێکەوە نراون؟ دەبێ چە هێزێک منی بێ دەستەڵاتی بەتاکی تەنیایی وەسەر ئەو هەوراز و کۆسپە دژوار و سەختانە خستبێ؟ ئەرێ دەبێ لە سەرەتاوە کێ ئەو سەودا پیرۆزەی خستبێتە ناو کەللەمەوە؟ دەبێ هۆی چی بێ کە بە درێژاییی تەمەنی خۆم بە بێ پسانەوە و ماندووبوون هەر لەسەری ڕۆیشتووم کەوا خونچە گوڵی لاوێتیشم لەسەر هەڵوەراندووە و تا ئێستا سەردەمی پیرێتیشم بەبێ ئەوەی کە هەست بە شەکەتی بکەم خستووەتە سەری، بە ڕاستی ئێستا خۆشم پێم زۆر سەیرە کە چۆن ئەو هەموو ڕووشە و تەشقەڵە و کارەساتانەی ڕۆژگاری سووک پەروەریش نەیانتوانیوە خاو و پەشیمانم بکەنەوە، هەزاران دەربەدەری و کۆچ و کۆچبار و گرتن و جنێو و تێ هەڵدان و بێڕێزیی دوژمنان نەک تەنیا نەیانتوانی لە شارێگای پەرا (خزمەت)ی زمانی کوردی و شەقامی نیشتمانپەرستێتیم لابدەن و بەس، بگرە هەزار هێندە چیرەتر و دڵگەرمتر دەبووم؟

داماو (حزنی) کاکم (١٢) ساڵان بێ سەروشوێن بوو و شین و شیوەنی کۆچی دواییشی بۆ کرابوو کەچی لە ساڵی هەرە دواییی شەڕی گەورەی یەکەمدا نامەیەکی لە

ئەستەمبووڵەوە بۆ بەهەشتی قازی عەلی باوکی پێشەوای نەمر هات و نووسیبووی کە من سەید حسێن کوڕی سەید عەبدوڵڵا نیفم دە دوازدە برا و خوشکم هەبوون چەند ساڵە هەزاران نامەم بۆ نووسیون و هیچ وەڵامێکم تا ئێستا پێ نەگەیشتووەتەوە وە ئاورم تێ بەربووە لە ڕێگای خوایدا هەر کەسێکم ماوە یا نەماوە پێم ڕاگەیەنن و وا بفەرموون کە ئەوانیش نامەم بۆ بنووسن. زۆر چاکم لە بیرە کە قازی عەلی و سەیفولقوزاتی برای و میرزا محەمەد و میرزا قاسمی کوڕی بە گەڵ هاتنە ماڵی ئێمە، ئەگەرچی ئەوسا شاری سابلاخی لە نێوانی ماڵی ئێمە و ئەواندا بوو و مزگێنی داینێ و هەر لەو کاتیدا بەناوی هەموو لایەکمانەوە نامەی بۆ نووسرایەوە ئەگەرچی بێجگە لە دایک و باوک لەنێو هەموو برا و خوشکەکاندا هەر من مابووم وەڵامی نەمانی هیچ کەسێکمان نەدایە تا باری ئاوارەیی گرانتر نەبێ لەو ساڵیدا بە یەکجاری هاتە شاری (حەلەب) و نووسی کە چەند برای گچکەم هەن هەموویان بنێرنە مووسڵ لەوێرا دەتوانم بیانگەیەنمە (حەڵەب) تا لە قوتابخاناندا پێیان بخوێنم، لەڕووی ئەوەوە کە تەنیا من مابووم، ئەوسا لە تەمەنی (١٢) ساڵیدا قوتابخانەی سەرەتاییم لە سابلاخی تا پۆلی (٦) تەواو کردبوو وە لەلای خاڵ و خاڵوزاکانیشم کە هەموویان مەلا بوون (شەرحل موغنی)م تا (مەڕفووعات)ی خوێندبوو، بابم منی بردە مووسڵ لەبەر پشێوی ڕێگای نێوانی (مووسڵ و حەڵەب) هەرچەندە دوو مانگانیش لەوێ مامەوە ڕۆیشتنم ڕێک نەکەوت و گەڕاینەوە سابلاخ. دیسان چەند برووسکەیەکی هاتە سابلاخ بە گورجی کە دووبارە گەڕاینەوە مووسڵ، خۆشڕۆ (ئۆتۆمۆبیل) ئامادە کرابوو من بە تەنیایی بەرەو حەڵەب و باوکیشم بەرەو سابلاخێ بە شیوەن و گابۆڕەوە کەوتینە ڕێ.

کە سەرنجم دایە کاکم هێندەی منداڵێکی خواردن و نووستنی نییە بگرە هەر کەرەستەیەکی مێژوویی کە لە نێوانی (١٢) ساڵانیدا کۆکردبوونەوە ڕێکوپێکی دەکردن و وەری دەگێڕانە سەر کوردی وە لە (١٩١٥)دا چاپخانەشی لە ئەڵمانیا بە پارەی مۆرهەڵکەندنێ بۆ زمانی کوردی کڕی. شەوێکی هەر لەخۆمەوە بە مامۆستا (محمد رجب الدسوقي)م هەڵدەکوت کە پڕوفیسۆری زمانی فرانسایی بوو. کاکم فەرمووی لێی بپرسە داخوا چەند نامیلکەی لە زمانی فرانساییییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تاتی (عەرەبی). سبەینێ کە لێم پرسی کوتی هیچ. کە بۆ کاکم گێڕایەوە فەرمووی: دیارە زۆر گێل و بێ مێشکە و شایانی ئەوەش نەبوو کە پێی هەڵبلێی چونکە هەر کەسێکی کە لە هەر لایەنێکەوە دەستەڵاتی هەبێ و ئاوڕێک لە زمانەکەی خۆی نەداتەوە جیاوازیی لەگەڵ ولاخان

نییه وه هەر لەو دەمیدا تێم ڕاخوڕی و کوتی: دا پەڕاوی (دەفتەر)ەکانت بێنە بزانم واتای وشە ئارەوی و فرانساییەکانت بە چە زمانێکی لێ داوەتەوە. منیش لەبەر ئەوەی کە تازە چووبوومە سووریە سەبارەت بەوەی کە لە زمانی فرەنسا و ئارەوییدا شارەزایی و هێز پەیدا بکەم چونکو زۆر بی دەستەڵات بووم واتاکانیانم بە ئارەویی نووسیبوونەوە ئەگەرچی چەند جارێکی تریشی بە گوێ دادابووم.

زۆر تووڕە بوو و کوتی تۆ لە مامۆستاکەت بێ مێشکتری. هەر لە ئێستاوە دەستە دەستە واتای وشەکانی ئارەوی و فرانسایی بە زمانی کوردی بنووسییەوە و ساڵ بە ساڵ بەپێی پێشکەوتنت بیراز و فرەوانتریان بکەیت تا لەژێر ئەرکی قوتابخانەت ڕزگاریی دێت دەبیە خاوەندی چەند فەرهەنگێکی ڕێک و پوختی کوردی و لە کوردییەوە بۆ چەند زمانێکی و لەوانیشەوە بۆ کوردی ئیتر هەر ئەو شەوە وا بڕیاردرا هەر وەکو پێشوو خۆی خەریکی مێژوو بیت بەلان ئەرکی فەرهەنگ و وێژە لە ئەستۆی من بێ بەو مەرجە کە بە هەموو توانایەکی خۆیەوە لە هەموو لایەنێکیەوە یارمەتیم بدات و گشت جۆرە هۆیەکم بۆ بسازێنی.

ئەوساکە هەمیشە ماڵی ئێمە پڕ بوو لە برا کوردەکانی سووریە و دیلەکانی ژێردەستی ترکان، لەو دەرفەتەدا هەر لە پاڵەوە وشەی تایبەتی زاراوەی وانم کۆ دەکردەوە و بێجگە لەوەش لەناو هەموو هۆز و تیرە و شارێکی کوردستانی باکوردا هەموو مانگێکی یەک دوو کەسی شارەزای زمانی لەسەر ئەرکی خۆی لەدوورەوە بۆ دەهێنام وە لە دە تا بیست ڕۆژان لەماڵی ئێمە دەمانەوە دوای ئەوەی کە سوودێکی پوختم لێ وەردەگرتن لەسەر ئەرکی خۆمان بەڕێی دەکردنەوە شوێنی خۆیان. هاوینانیش منی لەگەڵ چەند برادەرێکی بەناو دێهاتەکانی چیا کرمانج و دیاربەکر و ماردینیدا هەر بۆ ئەو مەبەستە دەگێڕا. لە (١٩٢٥)دا کە هاتینە ڕەواندز لەوێش بەشێنەیی زاراوەی سۆران و بارزانییانم لە سۆرانییان و هی (نەهری و شکاک و عەبدۆیی)یانیشم لە بەهەشتی سەید تەها و دەست و پێوەندە مشەخت (مهاجر)ەکان وەردەگرت. ئیتر کە کۆڤاری زاری کرمانجی بەسترا و گوزەرانمان زۆر تاڵ و دژوارتر بوو ناچار بۆ ئەوەی کە خانووبەرە و گا و گۆیلکێکی کە هەمانبوو بیانفرۆشم و پینە و پەڕۆی ژیانمانی پێ بکەم بە دزی چوومەوە سابلاخی لەوێش عەجەم پەرستان ئاشکرایان کردم و گیرام و ڕەوانەی تەورێز کرام و ئیتر کە بەڵێنی لە هەموو خزمەکانم وەرگیرا کە جارێکی تر ڕوو لە عێراق نەکەمەوە و هەتاهەتایە بەندیواریم لەگەڵ کاکم نەمێنی، ئازاد کرام. ئیتر تا شەش ساڵانی تێدا مامەوە بەلان ڕانەوەستام زاراوەی موکریانم بە هەموو هۆز و تیرە و دێهاتەکانەوە لەگەڵ هی شکاک و عەبدۆیی و جەلالی و

لوڕ و کەلهوڕ و سنه (ئەردەڵان) بەپێی توانا لەگەڵ هەڵبەست و بەسەرهات و وێنەی بوێژان کۆکردەوە. بۆ زاراوەی سورچی و خۆشناو و زراری و ئیدی ساڵێکی لە باتاس دانیشتم لە (۱۹۲۹)دا کە بەماڵەوە هاتمە هەولێر زاراوەی ئەو ناوچەیە و بادینان و کۆیە و پژدەرێشم دەست کەوتن هەر لێرەوە دۆستایەتیشم لەگەڵ زۆر کەسی وەکو شێخ نوری شێخ ساڵحی و نوری سەعیدی سلێمانی و چەند کەسێکی کەرکووکی پەیدا کرد هەرچییەکی تووانیبێتم لەوانم وەرگرتووە لە شاری کەرکووک چەند کەسێکی وەکو مامۆستا مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی و مەلا خورشید و گەلێکی تر زاراوەی ناوچەی کەرکووکیان بۆ کۆ کردوومەوە. لە (۱۹٤۰) تا (۱۹٤۸)وە سێ جاران چوومە سلێمانی و هەڵەبجە و هەورامان و زاراوەی سلێمانی و شارەزوور و جاف و تاوگۆزی و هەورامان و ئی دیکەم ئەوەندەی کە لە توانای سەلیقەمدا بووبێ کۆم کردووەتەوە، لە بەغداش لەنێو برا فەیلی و لوڕ و کەلهوڕ و شواناندا زۆر کەسی وەکو دوکتۆر جەعفەر و میرزا محەمەدی بوێژ و خوێندەوارانی تر یارمەتییان داوم. لە هیچ سەردەمێکیدا کەم و زۆر کاتی خۆم بە خۆڕایی ڕانەبواردووە. لە نانێکی هەژاریی بەدەر بەندیواریم بەسەر هیچ جۆرە خواردن و خواردنەوە و خۆش ڕابواردن و هاموشۆی سینەما و تەیاترۆ و باخ و باخچە و سەیران و سەیرانگایانەوە نەبووە. لە کاتی نەخۆشیشمدا هەر خەریک بووم لە هەینی و شەمە و یەکشەمەشدا وچانم نەداوە، لە نێوانی (٥٠) ساڵاندا ڕۆژی جێژنانیش نەحەساومەوە. بۆ سەعاتێک یا شەوێکی کە میوانم هاتبا لە کاتێکدا کە لەوانە نەبن سوودی فەرهەنگی و وێژەییان لێ وەرگیرێ خۆم بە بەندی و دیل زانیوە. بەندیخانەی هیچ دوژمنێکی نەیتوانیوە ڕستەی کاروبارم بپسێنی. لەناو بەندیخاناندا کە کوردی بە ناموسی زۆر تێدایە زاراوەکانیانم دەنووسینەوە، لە کاتی پشکنیندا کە ئاشکرا بووبایە دەیانکوت کوردی نووسین قەدەغەیە. دەمکوت لەبەر بێکاری کاتی خۆم بەو جۆرە دەکوژم یا دەمکوت شێوەی زاراوەی ئەو برادەرەم زۆر پێ سەیرە بۆیە نووسیومەتەوە، جارجارە لێیان دەدڕاندم وە یا دەیانسووتاند دووبارە دەمنووسینەوە. بۆ ئەوەی لەو لایەنەوە درێژەی پێ نەدەم تەنیا باسی گیرانی هەرە دوایی پارەکەی خۆم دەکەم کە چم کرد لە بەندیخانەی (حلە)دا، چەند برادەرێکی فەیلی و لوڕی تێدا بوون وەکو کاک محەمەد سەعیدی فەیلی و ئیتر نزیکەی (۱٥۰۰) وشەم پتر کۆکردەوە ئەگەرچی دوای گەڕانەوەم بۆ هەولێر دە پازدەیەک نەبێ هەمووییم هەبوو. مرۆڤێکی ئایینداری ڕاست چۆن شەو و ڕۆژ ناسرەوێ و بگرە تەنیا لە خودا پەرستێتیدا ڕادەبوێرێ، هەزاران سوپاس بۆ مامۆستای مەزنی موکریانی کە لەسەرەتای چاو کردنەوەمەوە تا دواکۆچی خۆی لە وانە (دەرس)ی

دابەشکرانی کوردستان و دواکەوتنی کوردانی پتر پێ نەکوتووم. ئەوەندەشی تێ گەیاندم کە چارەی تەنیا بە یەکەتی و هەوڵ و تەقەلایەکی بێ وچان و گیانبازییەکی نەبەزانەوەیە. دیارە ئەمەگداریم لە ڕاست برا و نیشتمان و گەلە دابەشکراوە دوواکەوتووەکەمدا منی لە سەر ئەو سەودا پیرۆزە و چڕ و کرووژم هەڵێناوە بە ئەندازەیەکی وا کە هێژاترینی تەمەنی منداڵی و لاوی و پیـریم لە پێناویدا داناوە، هەرچەندە لەو ڕێگا درێژەداو لەو کـاروبارە گرانانەدا هەزاران دەردەسەری و ئازار و مەینەت و تاڵاوی نەگبەتیشم چێژتووە و ڕەنج و ئەرکێکی بێ ئەندازەم لەسەر کێشاوە و زۆرترینی دەرفەتی کار و سەودا و ماڵدارییێتیم لەسەر چواندووە، ئێستاش لە تەمەنی (٦٠) ساڵیدا لە چاپخانەی خۆمدا خۆشم کارگەر و ڕەنجبەرێکم وە دژوارترین فەرمان لەسەر شانی خۆمە، سەرەڕای ئەو هەموو ئازار و ڕەنج و ئەرک و هەژاری و ......م نەک تەنیا پەشێمان نیم و بەس بگرە شانازی بەسەر چەرخ و گەردوونیدا دەکەم بەڵگەشم ئەو بەندە (قـصـیـدە)یە کە لە (١٩٤٠)مـدا داناوە و ئەوەش سەرەتایەکەیەتی:

بە خـــۆشی ڕابوێری یا بە ناخـــۆش<br>
مـــەیی ئاکـامی ناچاری دەکـــەی نۆش<br>
وڵات هەراوودە (خـزمـەت)ێکت لێ ببینێ<br>
لە دوا ڕۆژ هەر ئەوەندەت پـێ دەمـــێنێ

هەموو کەسێک لە سەردەمی هێز و توانای خۆیدا بیرێک لە کاتی نەخۆشی و پیری و لێقەومانی دەکاتەوە کەچی ئێمە کە لە حەڵەب خانووبەرە و دووکانیش هی خۆمان بوو بە هۆی پیشەی زەنگۆغرافی و چاپخانە و مۆری باش (کە پیتی بە دوو مەجیدییان هەڵدەکەنرا) وە مۆری جیل (لاستیک) و تابلۆی زەرد و خۆشنووسی و ناو و دروشم لەسەر شووشە و هەموو کانێکی نرخداری وەکو زێڕ، زێو و پیرۆزە و یاقووت هەڵکەندن، ڕۆژێ بەلای کەمەوە دە دوازدە لیرەی زێڕمان دەستکەوت بوو چونکو لە هەموو سووریە و لوبنان و میسر و عێراق و ئەستەمبۆڵێمانەوە کاری وا بۆ دەهات. ئەو هەموو سوود و داهاتانەمان خستە لاوە وە وامان بە بەرژەوەند زانی کە بگەینەوە کوردستان و بە نان و دۆیەکی قایل و تا دوا هەناسە پەرای (خزمت) زمان و گەلە دواکەوتوو و دابەشکراوەکەمان بکەین چونکو هەرچییەکی لە سووریەمان چاپ دەکرد بە زۆرترینی کوردستان نەدەگەیشت یا گومرگ دەیدڕاند وە یا پۆلیس دەیسووتاندن بەو هۆیەوە لە ڕەواندزێ گەیشتینە رادەیەکی وا نانی

وشكيشمان له هەرزانیدا پێ پەیدا نەدەبوو چونكو یاریكاریمان نەدەكرا به جێگای خۆی بەڵان بوختان و درۆی زۆر ناڕەوایان بۆ هەڵدەبەستین بۆ ئەوەی ئامۆژگاری و نووسینی ئێمه كاریگەر نەبی و دوژمنەكانی كورد سوودی لێ ببینن. ئێستاش بەنده بەناوی خۆم و خانەوادەی خانەدانی موكرییەوه له ڕاست ئەو ژیانه تاڵه بێ ڕێزییەماندا سوپاس بژێرم و له كانگای دڵیشمەوه شانازیی پێوه دەكەم چونكو ئەگەر یارمەتی درابایەن و یا بەهێندمیان گرتبایەن خەباتەكەی ئێمه بێ نرخ وه لەگەڵ كوڵ هەڵگر (حمال)ێكی جیاوازیمان نەدەبوو.

بەڵێ هەرچەنده لەلایەن سامان و داهاتەوه دەستكورتم بەڵان لەلایەن سامانی فەرهەنگی و وێژەیی و كەرەستەی مێژووییدا له كوردستاندا هیچ كەسێكی له خۆم به دەوڵەمەندتر نابینم. مرۆی پارەدار دەتوانێ تەنیا كۆشك و تەلار بۆ خۆی و منداڵەكانی دروست بكات كەسی تریش خێری لی نابینێ وه زۆر زووش بەسەر خۆی یا منداڵەكانیدا دەتەپێ بەڵان بەشانازییەوه دەڵێم به سامانی تێكۆشانێكی بێ پسانەوه و نەبەزانه سەرا و سەراپەردەیەكی وامان له فەرهەنگ و مێژوو و وێژه دروست كردووه كه نەك تەنیا ئێمه و منداڵەكانمان بگره نەتەوه دواكەوتوو و كوردستانه دابەشكراوەكەم سوودی لێ دەبینن و بەو مەرجه كه هەتاهەتایه له توانای باو و بۆران و گەڕانی چەرخی چەپگەڕدا نەبێ كه موویەكی لێ بكاتەوه و مەیدانی ئەوەش له دوژمنان وه تەنگ هەڵدێنی كه دەیانفەرماند زمانی كوردی پێی نەنووسراوه و هەرگیز پێشی نانووسرێت و فەرهەنگ و پەرتووكیشیان نییه.

ئەوانەی كه ئێمه هەر دووك برا ماومانه ئەگەر هەمووی چاپ كرێ لەوانەیه كه زمان و مێژوو و وێژەی كوردی ڕێگەی (٥٠٠) ساڵ دواكەوتنی بەماوەی (٥٠) ساڵان بڕیبێ. گەورەترین هۆی سەرگەرمی و خاو نەبوونەوەم له ڕێگای وێژەدا سێ چت بوون:

١- هەموو نەتەوەیەك هەزاران پەرتووكی زمان ناسی و وێژەیی و مێژوویی و ئیتریان لەبەر دەستاندایه تەنیا نەتەوەی كورد لەولایەنەوه بێ بەهره بوو ئەویش له سایەی میرزا و مەلا بێگانه پەرستەكانمانەوه.

٢- تەوس و تەشەری دوژمنان سەرەڕای ئەوەی كه خۆیان كورد و كوردستانیان بەسەر خۆیاندا بەشیوەتەوه وه هەر خۆیان نووسین و خوێندنیان به زمانی كوردی لێ قەدەغه كردووین و هەزاران نامیلكه و پەرتووكی نرخداری كوردانیان سووتاندووه یا لەژێیه ئاویژتووه سو هەر ئەوانیش تۆوی ناكۆكی و ناتەباییيان لەناو هەموو تیره و خێڵات و

شار و دێهات بگرە بەناو هەموو ماڵێکیدا چاندووە کەچی زۆر بێ شەرمانە هەر ئەوانیش دەپرسن کە بە زمانی کوردی نانووسرێ و هیچ نامیلکە و پەرتووکیشیان نییە ئەگەر تاکتاکە خوێندەوار و وێژەوانێکیشیان لێ هەڵکەوتبێ لە سایەی وێژەی فارسی و ترکی و ئی ترەوەیە وە خۆشیان نەتەوەیەکی ڕاستەقینە نین.

٣- فەرهەنگ و وێژەی چەند هەزار ساڵە بۆ کوردی ئەمڕۆ کە بەڵگە هەر نەماوە و یا زۆر کەم هەیە دەتوانم بڵێم لەم کۆڕەدا تێکۆشان و سەرکەوتن لە هەموو ئاکارێکی تر سەختتر و دژوارترە، ئاکاری وا زل و گرینگ بە دەوڵەتێک هەڵدەسووڕێ کە بەدەستە زانایەکی بسپێرێ بەو مەرجە پەرۆشی نان و دۆ و هاتوچۆ و دوور و نزیکییان نەبێ و لەلایەن بێکەسیتی و ئاوارەییشەوە بێ باک بن، لە نێوانی دە پازدە ساڵاندا بەناو هەموو تیرە و هۆز و خێڵات و شارێکی کوردستانیدا بگەڕێن و هەر وشەیەی چۆنی کرک (تلفظ) پێ دەکرێ وای بنووسنەوە وە چەند واتایانیش هەڵدەگرێ (تۆماری بکەن) داخەکەم ئەوەشمان نەبوو، هەڵسووراندنی کارێکی وا دوور و درێژ تاکە کەسێک دەتوانێ بەتەمەنێک هەوڵ و تەقەلاو لەخۆبووردن چتێک پێکەوە بنێ نەک بە دوو سێ ساڵ یا (١٨) مانگ.

داخی گرانم ئەو هەستەشم لە هیچ شوێنێکەوە بە هیچ کەسێکەوە نەدیت تەنیا لەو دواییەیدا ئەمیر جەلادەتی بەدرخانی و مەردۆخ و شێخ محەمەدی خاڵ و کوردۆیێڤ دەستیان تێوە داوە هەر کەسەی بەو چەشنەی خوارەوە یادگارێکی نرخداری فەرهەنگیان بۆ کورد پێکەوە ناوە.

فەرهەنگەکەی مامۆستا ئەمیر جەلادەتی بەدرخانی لە کوردییەوە بۆ زمانی فرەنسایییە و لە زاراوەی باکوری بەولاوە تێدا نییە و تەنیا بە تلینڤیس (تایپ ڕایتەر) لە ١٩٣٥دا چەند ژمارەیەکی لێ چاپ کراوە.

فەرهەنگی مەردۆخ مامۆستا شێخ محەمەدی مەردۆخ (آیت اللّه) سنەیی لە ١٩٥٦دا فەرهەنگێکی گەورەی دووبەرگیی لە کوردییەوە بۆ فارسی و ئارەوی داناوە و لەسەر ئەرکی شای ئێرانی لە تارانی چاپ کراوە داخەکەم لە وشەی ئەردەڵانی و هەورامی و تاک تاکێکی موکری بەدەری تێدا نییە و هەر وشەیەشی تەواو نەخستووەتە شوێنی خۆی و نەدەبوو بە دەستنووسی خۆی لەسەر شێوەی کۆن چاپ کرێ چونکو لە هەموو شوێنێکیدا شێوەی نووسینی وا بە ئاسانی ناخوێنرێتەوە و گۆیا بە (١٨) مانگی داناوە، پیتی (ڤ)ی تێدا نییە

بەلان ئەلفوبێیەکی بەرزی بۆ زمانی کوردی داهێناوە و شایانی سوپاسە.

قازی شێخ محەمەدی خالیش پار بەرگێکی لە فەرهەنگی خال لەسەر ئەرکی وەزارەتی فەرهەنگ بە چاپ گەیاندووە و لە کوردییەوە بۆ کوردییە و تەنیا (٥) پیتە (ا، ب، پ، ت، ج) خۆی وای دەربڕیوە کە لە (١٩٣٥)دا دەستی پێ کردووە هەرچەند داگر (شامل)ی هەموو شێوەکانی کوردی نییە چونکو لە سلێمانی و هەولێر و مووسڵ بەدەر نەگەڕاوە بەجێی خۆی بەلان خۆزگە ترکیشی زانیبایە بۆ ئەوەی لاپەڕەی فەرهەنگە نرخدارەکەی بەو وشەی ئالتوون و باخچە باشی و قاپی و ئیتر چەپەڵ نەکردایە، زمانی کوردی هێندە دەوڵەمەندە لەوانەیە کە هەموو زمانێکی ڕۆهەلاتی ئاتاجی بێ و ئاتاجی هیچ زمانێکی تر نییە، هەرچەندە برایەتیی کورد و فارس سوو (شک)ی تێدا نییە چونکو فارس تیرە و هۆز و خێلێکە لە کورد و نەتەوەیەکی جیاواز و سەربەخۆ نییە سەرەڕای ئەوەش نەدەبوو، ئابخانە، ئابدەست، ئاخوون، ئارا، ئاراستن، ئارایش و ئەوانەی کە بەندیوارێکی تایبەتییان تەنیا بە زمانی فارسییەوە هەیە بەکاریان ببات ئیتر بەهەر جۆرێ بی هەر شایانی سوپاسە.

مامۆستا کوردۆیێفیش پار فەرهەنگێکی کوردی و رووسی لە لێنینگرادەوە بۆ ناردوم و لە دوو لاپەڕاندا بە زمانی کوردی و رووسی زۆر لە من و فەرهەنگەکانم دڵسۆزانە دواوە هەرچەندە بەندە رووسیش نازانم بەلان وشە کوردییەکانی کە بە تیپی لاتینی کوردی نووسراون باش دەنوێنن کە وشەی فارسی و ئارەوی و تورکیی زۆر تێدایە کە ئەوە دوور بوو لە زانایەکی وا مەزن.

لە شێوەی باکور بەدەر تاک تاکە وشە و زاراوەکانی شوێنەکانی تری تێدایە و شایانی سوپاسە، ئیتر کە تەماشام کرد لە هەموو لایەکیەوە بێگانان کوردانیان بە مووچە و بەرات و خۆش ڕابواردن بە چەشنێکی وا چاو بەستووە کە دەمە خۆش ڕابواردنێکی خۆیان بە ئازادیی گەل و هۆزەکەیان ناگۆڕنەوە لەو لێکدانەوەیەمدا بەزەییم پتر بە دواکەوتن و بێکەسێتیی نەتەوەکەمدا هات بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ دڵقایمتر و پشوودرێژتر بووم تا بە یاریکاریی خوا کۆتاییم پێدان کەوایە دووبارە هەزاران سوپاس بۆ ڕەوانی پاکی ئەو مامۆستا دڵسۆزەم کە لە سەرەتاوە منی خستووەتە سەر ئەو ڕچەیەی کە لە دواڕۆژدا دەبێتە شارێگای ئازادیی گەلە دواکەوتوو و بەختیاری و ولاتە دابەشکراوەکەم.

ئایا وشەم چۆن کۆ دەکردنەوە؟

ئەرێ لە پێناوی وشە کۆکردنەوەدا تووشی چەند کۆسپە و گرێ و هەڵەتان هاتم؟

وه چۆن بەسەریاندا سەرکەوتوو و زاڵ بووم؟

داخوا هەر کەسێکی وشەیەکی دابامێ بەبێ لێکۆڵینەوە دەمهاویژتە ناو فەرهەنگەکەوە؟

لەپێشدا لە سووریە (لە شاری حەڵەب) پەڕاوێکی (٥٠) لاپەڕەییم بە تێکەڵاوی پڕ کردەوە ناچار پەڕاوییەکە کرا بە (١٠٠ لاپەڕەیی بگرە گەیشتە ٤٠٠ لاپەڕەیش بەڵان لەبەر نارێکی و ناپوختی و تیکەڵاوی و دووپاتەکانی زۆر بە ئاستەم وشەی تێدا دەدۆزرایەوە، کاتێکی لە زمانی فرانسەدا شارەزاییم پتر پەیدا کرد و توانیم سوود لە لارووس و فەرهەنگانی تر وەربگرم، کە سەرنجم دانێ بە ئاسانیان وشە تێدا دەۆزرێتەوە کەمێک چاویان کردمەوە، ئەوجار هێنام بۆ یەکەمین جار فەرهەنگەکەی خۆم لە ناو دوو دەفتەراندا نووسییەوە کە هەر یەکەی (٤٠٠) لاپەڕە بوو بە چەشنێکی وا کە تەنیا سەری پیتەکانم لە یەکتری جوایەز کردنەوە بەڵان دیسان بۆ وشە دۆزینەوە ئەگەر لە وشەی گورگ گەڕابام دەبوو پیتی (گ) هەموو بخوێنمەوە جگە لەوەش تووشی چەندین کۆسپەی سەختتر هاتم بۆ وێنە ئەگەر لە بەندی (د) یا پیتێکی تردا چەند وشەیەکم دەست کەوتبایە و جێگایان نەبایە تێیدا بنووسمەوە دەبوو دووبارە هەموو فەرهەنگەکە لە سەرڕا بنووسمەوە تا جێگایان ببێتەوە خوا دەیزانی ڕەنگە لە سەرەتاوە تا (٣٠) ساڵان (٢٠) جارانم پتر هەمووی نووسینەوە هەرچەندە هەموو جارێکیش بە بڵاویم دەنووسینەوە بەڵان سامانی زمانی کوردی هەمووی پڕ دەکردەوە وەنەبێ هەر جارەی تەنیا سەبارەت بە یەک دوو لاپەڕە هەموویم نووسیبێتەوە بگرە لە زۆر شوێناندا لاپەڕەکانی وە تەنگ هەڵدەهات ناچار هەموویم سەرلەنوێ نووسینەوە. لە ئەنجامدا ساڵی (١٩٤٠) هەموویم زۆر بە بڵاوی لە ناو (٦) پەڕاویانی پان و درێژدا نووسینەوە کە هیچیان لە (٤٠٠) لاپەڕە کەمتر و لە (٧٠٠) لاپەڕە پتر نین کە تا ئێستاش هەر ئەوانن ماونەتەوە ئەگەرچی لە زۆر شوێناندا لاپەڕەکانیان پڕ بوونەتەوە بەڵان زۆر ڕێکوپێکن و تێکەڵاوی و پاش و پێشییان زۆر کەمە.

## چەشنی واتا وەرگرتن

لەپێشدا لکەکانی سەرچاوە (مصدر)یشم وەردەگرت وەکو: خواردم، هات، دەڕوا و... هتد بەڵان کە خوێندەواریم بەهێز بوو تەنیا ناو و سەرچاوە (مصدر)ی تێپەڕ و تێ نەپەڕ و ئامرازەکانم تۆمار دەکردن.

## چۆنم پشت بە وەرگرتنی وشان دەبەست؟

بۆ وێنە ئەگەر وشەیەکم لە برایەکی دیاربەکری وەرگرتبایە بە جوایەزیم دەنووسییەوە و بەشێنەیی لە دوو کەسی تری دیاربەکریم دەپرسی ئەگەر ئەوانیش تاک تاکە بەبێ ئەوەی کە ئاگایان لە یەکتری هەبێ قەولیان بۆ ڕاستیی وشەکە کە هی دیاربەکرە و بۆ دروستی واتایەکەیان کێشابایە ئەوسا بە دلنیایی دەخرایە نێو فەرهەنگەکەوە.

## ڕێوشوێنی وشە کۆکردنەوەشم بەو چەشنە بوو:

لە ڕووی ئەوەوە کە لەپێشدا بە تێکەلاوی و پچڕپچڕی و بێ سەر و بەریم کۆ دەکردنەوە، مەیدانی پرسیارم زۆر تەنگ و دووپاتەشی مشە بوو بەلان باشترین ڕێگایەکی کە بۆ ئەو مەبەستەم لە دواییدا دۆزییەوە ئەوە بوو: لەشی مرۆ، جلوبەرگ، خانووبەرە، ناومال، بالندەی کەوی، بالندەی کێوی، ولاخ و ئاژال و ولس (حیوان)انی کەوی، هی کێوی، هی درندە، ئەستێرە، زیندەوار، گیانلەبەرانی ئاوی، بەر دووکانان و چەند سەد چینێکی ترم کردنە دەستەبەندی و هەر کە یەکێکم دەست بکەوتایە هەموویم یەکەیەکە لێ دەپرسی کە ئێوە بەوە دەلێن چی؟

ئیتر لەو ڕێگایەوە زۆر زۆر دەولەمەند بووم ئەوجار مانگی هێندەی سالێکی جارانم وشە پتر دەهاتە دەست.

شێوەی ئاخاوتن و زاراوەی هەموو شوێنێکی کوردستانم بۆیە خرکردەوە چونکو دەمزانی لەو ڕێگایەدا دوو ئەستێرەی ئاواتم دەکەوێتە ناو باوەشەوە:

١- لەڕووی ئەوەوە کە بە شێوەی موکری یا هەورامی، لوڕ، وە یا بۆتانی و ئیتر بە تەنیایی بە هیچ کامێکیان هەموو ئاوات و نیاز و سکالایەک نانووسرێ مەگەر وشە لە فارسی و ئارەوی وەرگرن، بەلان بە تێکەلاویی هەموو بیر و باوەڕ و دەردی دلێکی بە پوختی پێ دەنووسرێ منیش بۆ ئەوەی کە وشە لە بێگانان نەخوازرێتەوە و فەرهەنگەکەشم دەولەمەند بێ بەهەر ئەندازەیەکی کە لە توانامدا بوو هی هەموو شوێنێکم کۆ کردووەتەوە.

٢- کە بێتوو تەنیا بۆ وێنە بە شێوەی موکری بنووسرێ نەک کوردی هیچ شوێنێکی تر سەری بۆ شۆڕ ناکات و بەس بگرە دەبێتە هۆی ناکۆکی و ناتەبایی کە تەنیا ناکۆکیی

ناوخۆیی کوردانە کە کوردی دواخستووە و کوردستانیشی وەکو ماڵی میراتی بەسەر ئەم و ئەواندا بەشیوەتەوە، هەر کەسێکی لاگری ناکۆکی و ناتەبایی بێ دژمنێکی ناپاکە و لە دیوانی کوردەواریدا بەرپرسیارە.

بەندەش بۆ ئەوەی لە مێژووی کوردەواریدا بەدناو نەبم و مەیدانیش بۆ ئەوە تەنگ بیتەوە کە بە دوو شێوە بنووسرێ هەمووم تێکەڵاو کردوون چونکو بەدوو شێوە نووسین و خوێندن نیشانەی نەگبەتی و چارەڕەشێتیی دواڕۆژی نەتەوەی کوردە کە فارسیش هەر بەو چەشنە لە کوردان جوێ بووەتەوە.

ئەگەر چاوێک بە ڕابەر و کۆلکە زێڕینە و مەم و زین و وتارەکانی ناو هەتاو و فەرهەنگی مەهابادا بخشێنن ئاشکرا دەبێ کە لە هەموو تەمەنی خۆمدا گرینگترین ئاوات و مەبەست و ئامانجم تەنیا یەکەتیی زمانی کوردییە و لە مێژوودا شانازی بەو بیر و باوەڕە پیرۆزەمەوە دەکەم وە تا تەڕاییم لە لەشیدا ماوە لە ڕێگای یەکیەتیی زمانی کوردی لانادەم.

## بۆچی چاپی فەرهەنگی رابەر (المرشد) و مەهاباد وەپێش فەرهەنگی کوردستان کەوتن؟

لە ١٩٤٧دا کە بەهەشتی محەمەد عەلی عەونی میسری هاتە هەولێر و بە دوور و درێژی چاوی بەناو فەرهەنگەکانمدا گێڕا فەرمووی ڕابەری وەپێش هەمووان بخە چونکو مرۆ واتای هەر وشەیەکی ئارەوی بووێ بە ئاسانی تێیدا دەدۆزێتەوە دوای ویش فەرهەنگی مەهاباد. منیش ئەگەر تۆزێ لەشم ساخ بێ بە هۆی دەوڵەمەندەکانی سووریە و یا میسری فەرهەنگی کوردستان چاپ دەکەم. ڕابەر چاپ کرا کەچی عەونی بەگ لە پاریسەوە نامەیەکی بۆ نووسیم کە خۆزی فەرهەنگی مەهابادت پێش خستبایە چونکو لە رابەردا ئەندامی زمانی کوردی خویا (ظاهر) نییە. داخی بە جەرگم هەر ئەو ساڵی عەونی بەگ کە لە نەخۆشخانەکانی پاریسی گەڕاوە میسری کۆچی دوایی کرد.

## ئێستاش کە فەرهەنگی مەهابادم وەپێش فەرهەنگی کوردستان خستووە چەند هۆیەکی هەیە:

١- فەرهەنگی کوردستان زۆر گەورەیە و پیتی زۆر وردی گەرەکە بە قاقەز و بەرگی و ئەرکی کارگەرانەوە نزیکەی (٢٠٠٠) دیناری پتر تێ دەچێ، لەناو کۆواری هەتاوی هەتیو و جوانەمەرگیشدا زۆر جارانم هاوار کرد کە دەستە جوامێرێکی دڵسۆز وە یا چەند دەوڵەمەندێکی کورد بێنە پێش فەرهەنگی کوردستانیان بە خۆڕایی بە هەموو مافێکیەوە

پێشکێش دەکەم داخەکەم کەس سەری هەڵنەدا.

٢- فەرهەنگ لە کوردییەوە بۆ کوردی ئەگەر ڕاڤە (شرح) تەنیا بە ڕاوێژی سۆران بێ، هەورامی و بادینی و جزیر و بۆتانی و لوڕ و کەڵهوڕ و شوان و فەیلی تێی ناگەن و سوودی لێ نابینن خۆ ناشگونجێ واتای هەر وشەیەکی بە ڕاڤەوە بە شێوە و زاراوەی هەموو تیرە و هۆز و خێڵاتەکانی کوردستان بنووسرێ. بەڵان لە کوردییەوە بۆ ئارەوی یا لە ئارەوییەوە بۆ کوردی دیارە بەبێ سوو (شک) کوردی هەموو شوێنێکی سوودی لێ دەبینن چونکو بە هۆی مسوڵمانەتییەوە خوێندەواریی بەشی زۆرترینی کوردستان کەم و زۆرێک ئاشنای زمان و شێوەی ئارەوین.

ئەوەش لەیاد نەچێت کە فەرهەنگی ڕابەر هەرچەند (٤٠٠) لاپەڕەیە و (١٥٠٠٠) وشە دەبێ و فەرهەنگی مەهابادی چاپکراو کە نزیکەی (٨٠٠) لاپەڕەیە و (٣٠٠٠٠) وشە پترە لەبەر دەستکورتی لە کاتی چاپکردنیدا کورت کراونەتەوە دەنا هەردووکیان لەو قەبارەیە گەورەترن، خوا یار بێ لە چاپی دووەمیاندا زۆر گەورەتر دەبن.

### ئەلفوبێی کوردی بە تیپی ئارەوی

لەلایەن ئەوەوە کە ئەلفوبێی ئارەوی چۆن گەیشتووەتە رادەیەکی وا کە ئەمڕۆ بە پوختی پێی بنووسرێ و زۆرترینی دەنگ و شێوەکانی زمانی کوردی دەپارێزێ زۆر کەس خۆی پێوە شەکاندووە و لەو مەیدانەدا ڕمبازیی کردووە و هۆی پێشکەوتنی زمانی کوردی لە هەموو لایەنێکەوە تەنیا داوەتە پاڵ خۆی بەڵان بە باڵی چەکچەکیلە پێشی تیشکی خۆر ناگیرێت. ئەوا منیش هەرچێکی لەو لایەنەوەی دەزانم بە کورتی لەسەرەتاوە دەیخەمە پێش چاوانەوە ئەوسا بە دڵ و دەروونی پاک و بەزەییدار و ڕاست پەروەرانی دەسپێرم:

لە پێش هەموو سەربردەیەکیدا پیتەکانی چاپخانەی کوردستان کە لە (١٩١٥)دا دامەزراوە لەگەڵ دەستنووسە کۆن و تازەکانی فەرهەنگەکانم کە لەماوەی (٥٠) ساڵاندا نووسراونەتەوە و ئێستاش هەر ماون گەورەترین بەڵگەن.

داماو (حزنی) موکریانیی برام کە بە پارەی مۆرهەڵکەندن و خۆشنووسییەوە چاپخانەی لە (١٩١٥)دا لە ئەڵمانان کڕی و لەو دەمیدا هیچ جۆرە پیتێکی بۆ زمانی کوردی دەست بدات نەبوو ناچار هەر خۆی بە هونەرمەندێتیی خۆی قالبەکانی (پ، چ، ژ، ڤ، گ)ی هەڵکەندن و لە ئەڵمانیایە لەسەر کیسەی خۆی بە داڕژتنی دان. لەو کاتیدا لە ئێرانیشدا

دوو جـۆره چاپ هـەبـوو، چاپی بەردی (کـه چونکو به پێنوس دەنووسـرێ (پ، چ، ژ، گ)یان تێـدا دەنووسی دووەمـیـان چاپی سـوربی وەکو ئـەوانەی ئێسـتا کـه به یاریکاریی پیتـانی داڕێژراو چاپ دەکـرا. وه لەوەی دووەمـدا هیچ جـۆره پیتـێکی بۆ کـوردی وه یا بۆ فـارسی دەست بدات نەیانبـوو (بۆ ڕاستی ئەو مـەبەستـه تەمـاشایەکی چاپەمەنییەکانی (٥٠) سـاڵ لەمەوبەری ئێرانی بفەرموون).

لەو حـەلیـدا عەجـەمـێکی خۆیی لەشاری حـەڵەبی شـابەندەری ئێرانی بوو، بەبێ مـووچه و بەرات و زۆر لات و برسـی بوو چ ئێرانیشی لێ نەبوو لەسـەر زگیـان بلەوەڕێ. بەڵان لەڕووی ئەوەوه کـه دوای شـەڕی گـەورەی یەکـەم کـورده دیلەکـانـی یۆنان و ئەوروپا و حـیـجـازی که سـەبارەت به پارێزگـاریی تـاج و تەختـی ترکـان گـیـرابوون، یەک یـەک و دوو دوو و دەسـتـه دەستـه به حـەڵەبیدا به برسـێـتی و ڕووتی دەگەڕانەوە، کـاکیـشـم هـەمـوویانی تێر و تەسـەل و کۆک و پۆشتـه دەکردنەوه و پەساپۆرتیشی به خۆڕایی له شـابەندەری ئێرانی بۆ وەردەگرتن و لەسـەر کیسەی خۆی ڕەوانەی عێراقی دەکردنەوه له بەرامبەر ئەوەدا کاکیشم شـابەندەری ئێرانێی به ماڵ و منداڵەوه بەخێو دەکرد وه سـاڵی هـەریەکەی دوو دەسـتـه جلوبەرگیشی بۆ دەکردن وه کرێی خـانووبەرەکـەشی بۆ دەدان هـەرچەنده شـابەندەر بەهـۆی منەوه به ئـاواتی دەخـوازت که کـاکم پـەسـاپۆرتـی ئێـرانێ وەرگرێ، دەیکوت تەنیـا مـەبەسـتم ئەوەیه کـه له سووریەدا پیـاوێکی وا سـەرودەر و زاناو بەناوبانگ ئەگەر بەندیواری به ئێرانەوه هـەبێ، بۆ ئێران و ئێـرانییـان مایەی سـەربڵندییه. کـاکیـشـم له وەڵامـدا به منی دەکوت بەو کـەره بڵێ ئێمه کوردین و عەجەم و فارس نین ئەگەر ئێمەش شابەندەرێکی کورد و ئاڵایەکی کوردی له سـەربانەکەی ببینین به کورنۆشەوه دەچین و خۆمان تۆمار دەکەین.

ئیـتـر شـابەنـدەری ناوبراو چاپخـانەکـانـی تەورێز و تارانی ئـاگـادار کـرد لەوەی کـه له ئەڵمانیایەدا قالبی پیتی (پ، چ، ژ، گ) دروست کراوه وه ئەوانیش کڕییان.

له سـەرەتایـەدا که بەندەش خـەریکی نووسـینەوەی وشـەی فـەرهـەنگی بووم له ڕووی ئەوەوه کـه زمـانی ئارییـان به ئەلفـوبێی سـامییـان نەدەنووسـرایەوه زۆرم ئازار دەکێـشـا چونکو به گـۆڕانی دەنگیـان واتاشـیـان تێک دەچوو بۆ وێنه (وەره)م (وَرَ) یا (وَرە) دەنووسی کـوردم به کرد نووسـیبـا، به یاریکاریی واتا نەبایه لەگەڵ (کـرد)ی کردنێم بۆ جیـاواز نەدەکرایەوە.
دوای چەندین سـاڵ ڕەنج و ئـەرک و مـاندووبوونێکی بێ جێ و خـەفەتخواردن هـەر وشـەیەکی که له نووسینـدا وه یەکێکی تر چووبایه به تیپی فرەنسـاییم دەنووسی چونکو بەو جۆره زۆر

ئاسان و بێ هەڵە دەخوێنرانەوە ئەوجار کەوتمە سەر وڕێنە (خەیاڵ)ی بۆچی زمانی کوردی بەتیپی (فرانسایی) پوخت دەنووسرێ و دەخوێنرێتەوە بەڵان بە هی ئارەوی وا نییە بۆم ئاشکرا بوو هۆی ئەوەیە کە بزێویی ئەلفوبێی فرانساییان بە پیتە بەڵان هی ئارەوان بەسەر و بۆر و ژێرە (اعراب) بۆیە بۆ زمانی کوردی دەست نادات ئەوجار لە جیاتیی سەر (فتحة) پیتی (ە) وە لە جیاتیی بۆر (ضمة) پیتی (و) لە جیاتیی ژێر (کسرة) پیتی (ی)م بەکار برد چەند ساڵێکیش وام بەسەر برد بەڵان هەموو برینێکیان پێ تیمار و سارێژ نەدەکرا، لەدواییدا کەموکوڕییەکانی ئەو (۳) پیتانەشم بەو جۆرەی خوارەوە چارە کردن:

kurdم بەتاکە واوێکی نووسی وەکو: کورد

kûpeم بە (وو) یانی بە دوو واوان نووسی وەکو: کووپە

komم بە (ۆ) واوێکی حەوت لەسەر نووسی وەکو: کۆم

لە جیاتیی (i)م تەنیا یەک (ی) نووسی وەکو: گیان، ژیان

لە جیاتیی (î)م دوو (ی) نووسی وەکو: پییر، شییر*

لە جیاتیی (ê) تاکە (ێ)یەکی (۷) لەسەرم نووسی وەکو: ڕێباز، پێرێ

ئەوەش بخەمە بەر چاوان باشە کە لەپێشدا (۸)م لەسەر پیتی (و) و (ی) دادەنا لەو دووایەیدا کردمە (۷)

ئیتر هەموو جارێکی چیمان بە بەرژەوەند زانیبایە لە ئەڵمانیا، ئەستەمبۆڵ، بێرووت وە یا میسرمان بە داڕژتن دەدا.

دوای ئەو هەموو دەردەسەرییەش تووشی پێسیر (مشکلە)ی (ل) و (ر) هاتم لەپێشدا. لە جیاتیی لامی (قەڵەو) دوو لام وە یا (^)م وە لە جیاتیی (ر)ێی گەورە دوو (رر)ێم دەنووسی وەکو: دلل، د^ل. باللل، با^ل. کررین، پرر، درر ئەوانەشم باش بە دڵیەوە نەدەنووسا هێنام (۸)م لەسەر (ل) و (ر) دانا وە لەو ساڵانەی دواییدا کردمە (۷) بەڵان (۷) لەسەر ڕێ جارجارە کە ماشەی کارگەرانی چاپخانەی وێکەوتبایە تێکدەچوو بەچەشنێکی وا کە وەکو یەک یا دوو یا سێ نوختانی لێ دەهات وە لەو بارەدا بۆ دەنگی (ر) زیانی زۆر دەبوو چونکو

* لەبەر ئەوەی نووسینی باوی کوردی ئەمڕۆ وا نییە بۆیە ناچار بوین ئەم (یی) بگوڕینەوە بە یەک (ی). لە سەرتاسەری فەرهەنگەکەدا ئەمەمان دەسکاری کرد بۆ سەر نەشێواندن لە خوێنەری کوردی.

دەیکردە (ز) وەیا (ژ) ناچار هێنەکەی (ر)ێم خستە ژێریەوە ئەویشم وەکو گونی قوڕ دەهاتە بەرچاو وە ناچار بڕیاری هەرە دواییم وا دا کە ژێرێک لەژێر (ر) بکرێ بەسە وەکو:

ڕاو، ڕێباز، ڕێواس، کرێن، فرێن

دڵ، کڵ، چڵ، پڵاو، کڵاو، خوڵا، بەڵان، بەڵکو. ئەو شێوەیە تا ئێستا هەروا ماوەتەوە جارێ نەگۆڕاوە.

## ئەلفوبێی کوردی بە تیپی لاتینی

ئەلف و بێ لاتینییە کوردییەکەی بەدرخانییەکان لەلایەن دەنگی (ڵ، ڕ، غ، ک، گ)دا کەم و کوڕێکی زۆر گرینگی تێدا بوو ناچار چارەی وانیشم دۆزییەوە وە لە ساڵی ٢٥٧٢ی کوردیدا ئەلفوبێیەکی لاتینی وێنەداریی زۆر پەسند و پوختم لە چاپخانەی کوردستاندا بە چاپ گەیاند.

هەرچەندە زۆریشم ئەرک و ڕەنج بە فێربوونی زمانی فرەنساییەوە کێشاوە، لە هەموو تەمەنی خۆمدا هیچ جۆرە سوودێکیشم لێ نەدیتووە ئەوەندە نەبێ کە چاوی لێکدانەوە و پێکگرتن و وردبوونەوەی بە چەشنێک کردمەوە و توانا و سەلیقەی ئەوەی پێ بەخشیم تا ئەلفوبێی ئارەویم بەو جۆرە هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردووە هەتا گەیاندمە رادەیەکی وا هەموو جۆرە دەنگێکی زمانی کوردی بپارێزی و کەموکوڕیی ئەلفوبێی لاتینی کوردی بەدرخانییەکانیش چارە بکەم کە ئەوەش بۆ من سامانی سەرزەوی و ئاسمانی دێنی چونکە ئەگەر ئەمڕۆش بەهەند نەگیرێ لە دواڕۆژدا مێژوو شانازیی پێوە دەکات و لە دوای مردنیشمدا بۆ من و نەوە و نەتەوەکەشم مایەی سەربڵندییە.

هەر کەسێکی زمانی فرانسایی نەزانی لە کەموکوڕیی هیچ ئەلفوبێیەکی تر تەواو ناگات. زانینی زمانی فرانسایی سوودێکی گرینگتریشی بۆ من بوو هەر وشەیەکی کوردی کە واتاکەیم بە زمانی ئارەوی نەزانیبایەوە کەسێکی تریش بۆی ساغ نەکردبامەوە لە رووی ئەوەوە کە واتایەکەیم بە زمانی فرانسایی دەزانی دەمودەست لە فەرهەنگی فرانسایی و ئارەویمدا دەدۆزییەوە.

ئەلفوبێی ئارەوی لەو ڕادەیەی کە هەڵگێڕ و وەرگێڕم کردووە پتری لەباردا نییە جارێ بەو چەشنەی ئێستای بۆ زمانی کوردی دەگونجێ کەی نەتەوەی کورد لە تاریکاییی نەزانی ڕاپەڕی و چرای زانست و هونەر و شارستانییەتی بەدەستەوە گرت خۆی سەرپشکە کە

ئەلفوبێیەكانی پێشینەی خۆی یا لاتینی وەیا هینەكەی مامۆستای مەردۆخی وەیا یەكێكی لەوان باشتر دابهێنی وە بەكاری ببات.

## سەرچاوەكانی بەشی كوردیی فەرهەنگی مەهاباد

فەرهەنگی مەهاباد لكێكە لە فەرهەنگی كوردستان كە (٤٥) هەزار وشەی كوردیی پەتی و (١٣٠٠) وێنەی پتر تێدایە و بە ڕەنج و خەبات و ئەركێكی (٥٠) ساڵی پێك هاتووە ئەوانەی خوارەوە سەرچاوەكانیانە:

١- داماو (حسێن حزنی موكریانی برام) كە یەكەمین مێژوونووسی كوردە.

٢- لە سووریەوە زۆر كەس یارمەتییان داوم و ئەوانەی ناویانم لەبیر ماوە ئەمانەن:

هەمزە بەگ، مستەفا بەگی بەرازی، حەقی كورداغی

٣- لە كوردە چارە ڕەشەكانی ژێردەستی تركان: شێخ محەمەد عەلی ڕەزای كوڕی شێخ سەعیدی وە چەند كەسێكی خزمی دوكتۆر فوئادی و هەزارانی تر.

٤- لە كوردستانی عێراقێ لە ڕەواندزێ زاراوەی سۆرانم لە زۆرترین دانیشتوانی شار و دەرەوە وەرگرتووە، هی شكاك و عەبدۆیی و نەهریم لە پاڵەوانی نەمر (سەید تەها) شەمزینی و دەست و پێوەندەكانی دەست كەوتووە و ئیحسان نووری پاشا و فەهمی زركلی و شێخ عەلی ڕەزا و مشەختە (مهاجر)ەكانی باكوریش زۆریان سوودی فەرهەنگی لێ دیتراوە.

٥- لە باتاس سەید عەبدوڵڵا كوری شێخ عەبدولقادری شەهید و عەبدوڕەزاق و سادق و زۆر كەسی تر بۆ زاراوەی باكور یارمەتییان داوم، دانیشتوانی باتاس و دەرەوەش بێ ئەژمار.

٦- لە هەولێریش هەزاركەس پتر بەڵان ئەوانەی كە لە یادم ماون ئەوانەن مەلا عەبدوڵڵا كونەفلووسە، فەقێ عەبدوڵڵا، مەلا خالد عەزیزی دزەیی، مەلا ئەحمەدی ژاژڵەیی، مامۆستا سەید حوسێن ڕەشوانی مامۆستا عەبدولكەریم زێدبەگی.

٧- لە بادینان هەزار كەس پتر یارمەتییان داوم تاك تاكێكی كە لە بیرم ماون ئەوانەن:

مەلا ئەنوەری مائی، مامۆستا محەمەد شاهین سۆفی، مامۆستا ساڵح یوسفی، مامۆستا محەمەد ئەرموغانی.

٨- لە کەرکووکی هەزار کەس پتر یارمەتییان داوم و تەنیا ناوی ئەوانەم لە بیر ماوە:

مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، مەلا خورشید سیامەنسووری، شێخ ڕەئوفی خانەقا، نەریمان.

٩- لە سلێمانی هەزار پترە و هەر ئەوانەم لە بیر ماون: زیوەر، فائق زیوەر، شێخ نووری شێخ ساڵحی، شێخ ئەحمەدی بەرزنجی، نووری عەلی، نووری سەعید، گۆران، عەلی کەمال، بێکەس.

لە هەڵەبجە: حەسەن بەگی جاف و زۆر کەسی تر کە ناویان نازانم.

لە هەورامان: شێخ سادقی برای شێخ حیسامەدین، کاردۆخی، شێخ عەلائەدین، سەید مەزهەر، مەلا عەبدولکەریم، میرزا ئەحمەد، شێخ حەسەنی قاضی و برایەکەی و زۆر کەسی تر. لە مەهاباد مەلای حەجۆکی، میرزا سەعیدی حەجۆکی، پێشەوای نەمر (قازی محەمەد)، سەیفولقوزاتی مامی پێشەوا، میرزا ئیبراهیمی قازی (بەڕێوەبەری زانیاریی مەهاباد) کە خزمی پێشەوا بوو، میرزا ڕەسولی باخچەی کە خزمی پێشەوایە، وە لە خاڵەکانی خۆشم (حاجی سەدرولعولەما، مەلا محەمەد سەعید)، مەلا محەمەد سەلیم، مەلا عەبدولقادر و هەزارانی تریش یارمەتییان داوم.

**پەڕتووک (کتێب)ە دەستنووس و چاپکراوەکانیش کە بەڵگە و سەرچاوەن ئەوانەن:**

١- فەرهەنگی بەدرخانییەکان لە ١٩٤٦دا کە پایەبەرز عیزەدینی مەلا ئەفەندیی هەولێری دەچووە سووریە ڕام ئەسپارد کە بە ئەمیر جەلادەت و دوکتۆر کامەران بڵێ کەسێکی بکەنە سەرپشک تەماشای فەرهەنگەکانی من و وان بکات ئەگەر هی وان لە ئیی من کەمتر و گچکەترە هی خۆیان بۆ من بنێرن ئەگەر هی وان مەزنتر و زۆرترە من ئیی خۆمیان پێشکێش دەکەم. دوای تەماشاکرانیان بەهەشتی ئەمیر جەلادەت ژمارەیەکی لە هی خۆیان بە نامەیەکی زۆر مەردانەوە پێشکێش کردم کە ئێستاش لەلامە، فەرهەنگی بەدرخانی ٦٢٤ لاپەڕەی گەورە و تەنکە و لە کوردییەوە بۆ زمانی فرەنساییە و بە تلینقیس (تایپ) چەند ژمارەیەکی لێ چاپ کراوە هەرچەندە لە زاراوەی باکوری بەدەر تێدا نییە بەڵان داخەکەم بە وشەی بێگانان ئاخنراوە. هەرچییەکی کە بە کوردیی پەتیم زانیوە و نەمبووبێ لێم وەرگرتووە ئەوانەی هەشمبوون هەڵەی شێوەی دەنگیانم بە هی وان ڕاست کردووەتەوە.

٢- فەرهەنگی مەردۆخ کە دوو بەرگە و بە هەردووکیان (١٩٤٢) لاپەڕەیە بە تیەن (حجم)ی

فەرهەنگی مەهاباد وە لە کوردییەوە بۆ فارسی و ئارەوییە و هەر لاپەڕەیەی دە دووازدە وشەیە بێجگە لەوەی کە بەتایبەتی هەر زاراوەی ئەردەلآن و هەورامی نیشان دەدا و لە بەکاربردنی هەزاران وشەی فارسی و ئارەویش دوانەکەوتووەو نووسیویە کە (١٨) مانگی خەریک بووە و ئەلفوبێیەکی زۆر بەرزی بۆ زمانی کوردی داهێناوە و چاپی فەرهەنگی مەردۆخی بۆیە پێش فەرهەنگی مەهاباد کەوت چونکو شا چاپی کردووە.

٣- فەرهەنگی خاڵ کە گۆیا چوار بەرگە و لە کوردییەوە بۆ کوردییە تەنیا بەرگی یەکەمینی کە (أ، ب، پ، ت، ج)ە لە ١٩٦٠دا لەسەر ئەرکی وەزارەتی فەرهەنگ لە ٢٦٦ لاپەڕەدا بە تیەنی مەهاباد چاپ و پەخش کراوە.

٤- زاراوەی زانستی کوردی لەلایەن مامۆستایانی سلێمانییەوە لە ئارەوییەوە بۆ کوردییە (٩٧) لاپەڕەی بەش بەشە لەبابەت زاراوەی وێژە، ڕێزمان، بەڕێوەبردن، پەروەردەی نیشتمانی، زانستی سروشتی، بیرکاری، ئەندازە، جەبر، ئەندازەی لەشدار، تێکەڵ، ژۆگرافی کە لە ١٩٦٠دا چاپ کراوە تێکڕا چوار چینن:

١- بەشێکی هەموو کەسێک دەیزانێ.

٢- بەشێکیش هی خۆمن وە لە چاپەمەنیی ئێمە وەرگیراون.

٣- هێندێکیشم لێ وەرگرتووە بەلآن ڕاستی و چەوتی لە ئەستۆی خۆیانە.

٤- هێندێکیشم خستنە پشت گوێ وێنەی:

بازنە، گەنگەتا، گەنگەموو، مەنگ وە زۆری تر بە تایبەتی ئەوەی کە (پیا، تیای) تێدا بێ.

٥- هەندێک، زاراوەی زانستی (١٤) لاپەڕەیە وە یادگاریی مامۆستا نەبەزە لە ١٩٦٠دا چاپ کراوە.

٦- فەرهەنگی گەنجینەی زمانی کوردی دەستنووسی مامۆستا عەبدوڵڵا عەزیز و کاکە ڕەشید پەشێو لە کوردییەوە بۆ ئارەوییە.

٧- فەرهەنگۆکی زانستی یادگاری مامۆستا نەبەزە لە دوا مانگی بەهاری ئەمساڵدا (٣٤) لاپەڕەی گەورەی بەو ناوەوە تا سەد ژمارەیەکی بە ڕۆنیۆ بە چاپ گەیاندووە لە رووی ئەوەوە کە چاپی فەرهەنگی مەهاباد گەیشتبووە پیتی (و) هیچ سوودم لێ وەرنەگرت. ئەویش لە کاتی دروستکردنی فەرهەنگەکەیدا چەند سەد لاپەڕەیەکی چاپکراوی لە فەرهەنگی مەهاباد لەلا بوو هەر لێشی نەدواوە.

### سەرچاوەکانی بەشی ئارەویی فەرهەنگی مەهاباد

١- مصباح المنبر، ٢- المنجد، ٣- كنز اللغة، ٤- منتخب اللغات، ٥- نەوبەهاری ئەحمەدی خانی، ٦- ئەحمەدی، ٧- اختری کبیر، ٨- القاموس المدرسي - انگليزي وعربي تأليف ألياس أنطون ألياس، ٩- القاموس المدرسي - عربي وانگليزي تأليف الياس أنطون الياس.
١٠- الفرائد الدرية في اللغتين العربية والفرنسية لأحد أباء اليسوعيين، ١١- قاموس في اللغتين الفرنسيه والعربية تأليف P.J.B.BEOLTS.J. زۆر وشەی وا رەق تووش هاتووم کە نەخۆم بە ئارەویی واتایەکەیم زانیوە وە نەکەسی تر بەڵان لە رووی ئەوەوە کە بە فرانساییم دەزانی لە فەرهەنگی فرانسایی و ئارەوییمدا بە ئاسانی دەدۆزییەوە.

ئەوەنەی کە بۆ بیراز (إصلاح) و چەوتی ڕاستکردنەوەی بەشی ئارەویی فەرهەنگی مەهاباد یارمەتییان داوم ئەمانەن:

١- مامۆستا حاجی مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی مودەڕیسی مزگەوتی شێخ نوری.
٢- مامۆستا جەمال نەبەز لە پیتی (آ) وە تا (د) جارجارە هاموشۆی دەکرد ئیتر وازی لێ هێنا چونکو دیارە فەرمانێکی تری وای بە دەستەوە بووە، کە بە لای وییەوە لە یارمەتیی فەرهەنگی لە پێشتر و باشتر بووە، زۆر سوپاسی دەکەم.
٣- مامۆستا حوسێن ڕەشوانی کە لە هەولێر مامۆستای قوتابخانەی مامۆستایانە کاتێکی لە میسری دەخوێند بەهەشتی عەونی بەگ رای ئەسپاردبوو کە یارمەتیم بدات لە ١٩٥٣دا کە گەراوە هەولێر جارێکی بە سەررەو بە هەردووکمان چاومان پێدا خشاند بەڵان ئەو ساڵ زۆر بە پوختی و رێکی بەو چەشنەی خوارەوە یارمەتیی داوم:

واتای هەر وشەیەکی کوردیم لە زمانی ئارەوییدا بەهەڵە دانابێ ڕاستی دەکردەوە ئەگەر دوور بایە یەکێکی نزیکتری بۆ دەدۆزییەوە هەر وشەیەکی ئارەویی کە زۆر رەق و ئی فەرهەنگی بایە یەکێکی ئاسانتری لە شوێنی دادەنا. کاتی کۆبوونەوەشمان شەوانە بوو، ماڵی ئێمە لە هەولێرێ لە گەڕەکی تەیراوەیە و هی وانیش لە ئازادییە و زۆر لێک دوورین و پێرۆشم تەنیا پێمە وە لە رووی ئەوەوە کە بە هۆی چەند نەخۆشییەکیەوە کە یەکێکیان تەوژمی خوێنە ژیانم لە تەلەزگەدایە.

سەرەڕای ئەوەی کە هەموو ڕۆژێکی بەبێ پسانەوە هەر لە بەیانییەوە تا ڕۆژئاوایە لە تەمەنی (٦٠) ساڵیدا بە سەرپێیانەوە کاروباری چاپخانە هەڵدەسوورێنم لە توانامدا نەبوو کە شەوانەش بە ماندووێتی و شەکەتی بە سەعاتێکی بچمە ئازادی بە سەعاتێکیش

بگەڕێمەوە بەڵان مامۆستا ڕەشوانی زۆر مەرد و مەردانە بە خۆشڕۆ (ئۆتۆموبیل)ی خۆی لە کاتی سەرما و گەرما و باران و تەڕ و تووشیشدا لە هەموو شەوێکی پێویستدا لە دوورەوە خۆی دەهاتە ماڵێ ئێمە، زۆر جاری وا بووە کە دەهات هێشتا لە لە چاپخانە دەستم لە کار بەر نەبووبوو دەگەڕاوە چاپخانە و بە سواری ئۆتۆمبێلەکەی دەیهێنامەوە ماڵێ، جاری واش هەبوو کە دەهات نە لە ماڵێ و نە لە چاپخانەدا نەیدەدۆزیمەوە سا یا لە ڕێگایەدا تووشی یەکتر دەهاتین و یا لە لای پزیشک و دەرمانفرۆشان دەبووم و وڕێنەی ئەوەم دەکرد و دەمکوت بە خوا ڕەوایە کە مامۆستا ڕەشوانی دڵی بشکێ و لەوانەیە کە جارێکی تر نەیەتەوە بەڵان شایانی سوپاسە کە هەستی نیشتمان پەروەرێتیی لە هەموو چتێکی تر بە هێزتر بوو بێجگە لە هاتوچۆی بگرە دوای چاپکرانیش هەڵەبژێریی بۆ کردم. هەرچەند لە سابلاخی بە منداڵی فەرهەنگی (منتخب اللغات)م هەموو لەبەر کردبوو کە لە ئارەوییەوە بۆ فارسییە و بە هۆی زۆر ئاشناییم بەسەر زمانی ئارەواندا مەلا و خوێندەوارەکانی سابلاخ بە منیان دەکوت (قاموس) دوای ویش دوازدە ساڵان لە سووریە بووم و جگە لەوانەش فەرهەنگی ڕابەر و مەهاباد نموونەی شارەزایی منن لە زمانی ئارەواندا بەڵان لە ڕووی ئەوەوە کە هەموو هۆش و هەست و سەلیقەی خۆم خستووەتە سەر زمانی خۆم، کە کوردییە و مامۆستاش نیم کە وانە بە زمانی فارسی، ئارەوی، فرانسایی و ئینگلیزی بلێمەوە، دیارە کەم و زۆرێک ڕێزمانی ئەوانم لە یاد چووەتەوە بەڵان مامۆستا ڕەشوانی کە تازە لە میسر گەڕاوەتەوە وە بە هۆی مامۆستایەتی بەندیواریی لەتەک زمانی ئارەویداڕۆژ بە ڕۆژ پتەوتر دەبێ بۆیە زۆرترین سوودێکی کە بۆ ئەو فەرهەنگەم لەوی دیتییە لە بابەت دەستوور و ڕێزمانی زمانی ئارەوییەوەیە کەوایە شایانە لە کانگای دڵەوە دەسکەگوڵێکی تەڕ و پاراوی سوپاسی پێشکێش بکەم.

***

لە بەشی کوردی و ئارەویی ئەو فەرهەنگەدا بێجگە لەوانەی کە ناوم بردوون زۆر کەسی تریش یارمەتییان داوم بەڵان لە ڕووی ئەوەوە ئەو فەرهەنگە زۆر لەمێژە تەواو بووە وە درەنگ چاپ کرا و ناوی وانیشم لەلا نەنووسرابوو لەیادم چوونەوە ئومێدم وایە لێم نەگرن و ئاگادارم بکەنەوە تا لە چاپی دووەمیدا مافی خۆیان بدرێتێ.

## هەرێم و شار و دێهات و هۆز و تیرە و خێڵاتێکی

## کە سەرچاوەی بەشی کوردیی فەرهەنگی مەهابادن ئەوانەن

ئاکرێ، ئاکۆ، ئالان، ئامێد، ئاوێستا، ئەردەڵان، ئەنەدۆڵ، ئۆمەربل، ئێرەوان، بابان، باتاس، بادینان، بارزان، بازییان، باشقاڵان، باکور، باڵەکان، باڵەکیان، بالیسان، بانە، باوەمەڕ، بەختیاری، بەرزنجە، بەرواری، بتلیس، برادۆست، بڵباس، بۆتان، بۆتی، بۆڵی، بێجووان، بیتوێن، پارسانی، پەهلەوی، پردێ، پژدەر، پێنجوێن، پیران، پیرەسنی، تاڵەبانی، تاوگۆزی، تولابی، تیلەکۆ، جاف، جەباری، جەلالی، جزیرێ، جوانڕۆ، جۆڵەمێرگ، حەسەنی، خانەقین، خۆشناو، خێڵەسات، داوودە، دەربەندی، دەشتەبێڵ، دەڵوو، دزەیی، دۆسکی، دۆڵەمەڕی، دهۆک، دیاربەکر، ڕەواندز، ڕەوەند، ڕۆژبەیانی، ڕوست، ڕێکانی، زاخۆ، زازا، زەند ئاڤێستا (زەند ئاوێستا)، زەنگەنە، زراری، زێبار، زیتکی، زبیل، ژاوەڕۆ، ژەنگار، سابلاخ، ساڵەیی، سەردەشت، سەرگەڵۆیی، سەقز، سعێرت، سمایل عوزێری، سنە، سۆران، سۆمەری، سوورچی، سووریە، سوێسنی، سیوەیل، شارەزوور، شارباژێڕ، شارویران، شاڵەبەگی، شەبەک، شەقڵاوە، شەمزینان، شکاک، شنۆ، شوان، شێروان، شیخ بزەینی، شینکایەتی، فەیلی، کاکەیی، کەرکووک، کەڵهوڕ، کرماشان، کرمانجی، کفری، کۆیە، کورد، کوردستان، کوردی کۆن، گەورک، گۆران، گۆیی، گێژ، لاجان، لەک، لوڕ، لهۆن، ماردین، مامەش، مامساڵ، مەرگەوەڕ، مەریوان، مەنتک، مەندەلی، مەنگوڕ، مەهاباد، مزووری، میللی، مووش، موکریان، میرمەحمەلی، ناوکوڕ، نەهری، نەپاخی، نەورۆلی، وان، وەرتی، هەرتەل، هەرکی، هەریر، هەکاری، هەڵەبجە، هەمەوەند، هەورامی، هەولێر، هۆرەمار، یەزیدی (یەزدانی - زەردەشتی).

## ڕێزمانی کوردی (قواعد اللغة الكردية)

هەرکەسێکی بیەوێ کە بەبێ هەڵە بە زمانی کوردی باخوێ (بدوێ)، بنووسێ و بخوێنێتەوە پێویستە فێری ڕێزمانی کوردی بێت. زمان دەنگی هەستی بیر و باوەڕ و کەڵکەڵەی مرۆیە کە لە کاتی ئاخۆتن و یا نووسینەوەیدا سەر هەڵدەدات.

ئاخۆتن و نووسینی زمانی کوردی بە هۆی ڕستە، هەڤۆک (جملة) ڕێک دەکەوێت. ڕستەش بە کۆبوونەوەی دوو یا چەند وشەیەکییەوە سەر دەگرێت. وشەش برێتییە لە دوو یا چەند پیتێکی کۆکراوە.

پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی ئەو (٣٧) پیتانەی خوارەوەن

ئا، ئە، ئو، ئوو، ئۆ، ئی، ئی، ئێ، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ذ، ر، ڕ، ز، ژ،
س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ک، گ، ل، ڵ، م، ن، و، ه، ی

پیتی (ث) تاک تاکە لە ئاوێستا (کوردی کۆندا) هەیە.

ذ: لە کوردی کۆن و (ئاوێستا)دا زۆرە ئەمڕۆش لە هەورامانیدا بە کاری دەبەن وەکو ئاذ (هو) ئاذە (هي) ئاذێ (هم، هن)

ص: ئەوەش لە زاراوەی ئێمە و باکوریشدا زۆرە وەکو صەد، صەگ ئەگەرچی ئەمڕۆ بە (س) دەنووسرێن وەکو سەد، سەگ بەڵان بەلای منەوە هەڵەیە چونکو پیتی (س) لەو وشانەدا ئەو دەنگە نادات کە نەتەوەی کورد کرک (تلفظ)ی پێ دەکەن.

ط: ئەوەش لە زاراوەی باکوردا زۆرە وەکو طەزی، طاری

ئەوا جارێ پیتەکانی (ث، ص، ط)م نەخستووتە ناو ئەلفوبێیەکەمانەوە تا چاپی دووەمی فەرهەنگی مەهاباد هەویام وایە کە ڕەوشەنبیرەکانی کوردی گەرمێن و کوێستانی، بیروڕای خۆیانمان لەو لایەنانەوە پێ ڕاگەیەنن.

## ڕێزمانی کوردی

ع غ هەروەکو لە لاپەڕە ٣١٧ و ٣١٨ دا وە بەرچاوتان دەکەوێت کە چەند وشەیەکیان پێ نووسراوە ئەگەر چی لە بنچینەشدا (ح، خ)ێن و (ع، غ) لە زمانی کوردیدا نییە بۆیەشم خستە ناو ئەلفوبێی فەرهەنگەوە تا ئەلفوبێی کوردی هەموو جۆرە دەنگێکی بێگانانیشی پێ بنووسرێ. لەو لایەنانەشەوە چاوەڕێی بیروباوەڕی هەموو لایەکتانم.

ئەلفوبێی کوردی دوو جۆرن: دەنگدار و بێ دەنگ دەنگدارەکان ئەو هەشتانەن

ئا: a، ئە: e، ئو: u، ئوو: û، ئۆ: o، ئی: î، ئی: i، ئێ: ê.

بیست و نۆ پیتەکانی تر بێ دەنگن پیتە دەنگدارەکانیش دوو بەشن درێژ و کورت:

دەنگدارە درێژەکان ئەوانەن: آ، اۆ، اوو، اێ، ایی.

دەنگدارە کورتەکانیش: ئە، او، ای، و، ی.

پیتی (و، ی): لە دووبارەکاندا بەکار دەبرێن جارێ وا هەیە پیتن شوێنی وا هەیە تێیدا دەبنە بزیوە:

(و، ی): لەسەرەتای هەموو وشەیەکیدا پیتن وەکو: وان، ورگ، ونجڕونجڕ، یار، یان، یەک.

(و، ی): لە دوایی وشانیشدا هەر پیتن بەو مەرجە کە پیتێکی دەنگداریان لە پشتەوە بی وەکو: ئاو، خەو، دێو، وەی، دەی، های.

(و، ی): لە نێوەڕاستی وشانیشدا هەر پیتن ئەگەر بکەونە دوای دەنگدارانەوە وەکو: داوێن، پایان، شایان.

(و، ی): لە هەموو شوێنێکیدا بزیوەن بەو مەرجە کە بکەونە دوای وشە بێ دەنگەکانەوە وەکو: دۆ، دوو، دوور، دێ، دێهات.

(ە، ە): (ە) لە هەموو شوێنێکیدا سەرە (فتحة) وەکو: دەرکە، پەردە. بەڵان لەجیاتی پیتی (H) هەمیشە و لە هەموو شوێنێکیدا تەنیا (ھ ـھـ) دەنووسرێ وەکو: هەناسە، دێهات، ڕەھ، پەھ.

وشە، واژە، پرس (كلمة)

وشە کە لە یەک و یا لە چەند پیتێکی دروست دەکرێت دوو بەشن:

١- وشەی سادە وەکو: ڕاز، باز، خواس.

٢- وشەی ئاوێتە وەکو: هاوڕاز، سەرباز، پێ خواس.

بڕ، کەرت، (مقطع).

بڕ: پارچە دەنگێکە لە وشە، هەر وشەیەی یەک یا چەند پارچە دەنگێکی تێدایە وەکو:

با، تار، ڕاو، تۆز، هۆش: هەریەکەی پارچە دەنگێکی هەیە.

پا ـ رە، بە ـ ران، بار ـ ی، بار ـ زا ـ ن: دەنگی هەر وشەیەکی دوو پارچەیە.

پا ـ رە ـ کە، خوا ـ رە ـ وە: دەنگی هەر وشەیەکی سێ پارچەیە.

پێ ـ را ـ رە ـ کە، دا ـ نە ـ وێڵە، ور ـ دە ـ وا ـ ڵە: هەریەکەی چوار دەنگی هەیە.

وشە (كلمة)

وشە (هەشت)لکی لێ دەبێتەوە:

١- ناو، نێو، ناڤ (الإسم).

٢- شێوە، ئاوەڵناو، ڕەوش (الصفة).

٣- ڕاناو، بەرناڤ، (الضمير).

٤- كردار، كرده، كردەوه، پیشك (الفعل).

٥- ئامرازی بەستنەوه، وشه ڕێكخەر، ئامرازی ڕێكخستن (أداة العطف والربط).

٦- ئاوەڵكردار، نیر، جێ، هۆكەر (الظرف).

٧- ئامرازی پێوەندی، پێربەست (أداة الجر والتعلق).

ناو:

ناو وشەیەكە بۆ ناوبردنی مرۆڤ، وەڵس (حەیوان) وه یا چتێكی بەكار ببرێت وەكو: ڕۆستەم، شێر، دار.

ناو دوو بەشه:

١- ناوی تایبەتی، ناڤێن بەرناس (إسم خاص).

٢- ناوی گشتی، ناڤێن جەلەب (إسم عام).

به ناوێك دەڵێن تایبەتی كه تەنیا ناوی كەسێكی یا چتێكی به تایبەتی نیشان بدات وەكو: داماو، موكریان.

ناوی گشتی ئەوەیه كه هەموو كەسێكی وه یا وەڵسێكی وه یان چتێكی له هاوتیره و هاوڕەچەڵەك و هاوچەشنی خۆی بگرێتەوه وەكو: پیاو، ژن، گا، ئاسك، كێو، شار.

ناوی گشتیش دوو جۆرن:

١- ئەنبووژەن (مادي).

٢- ناوی بژۆنی (معنوي).

ناوی ئەنبووژەن ئەوەیه كه ببینرێت وەكو: كورسی، باخ، ترێ.

ناوی بژۆنیش ئەوەیه كه نەبینرێت وەكو: بڕوا، وریایی، هۆش.

ناوی نێرینه و مێیینه:

له زمانی ئارەویدا زۆرترین مرۆیان به وێنەی (أديب، نجيب، حمدي) كه پیتێكی (ة)یان بخرێته سەر دەبنه هی مێیینان وەكو: أديبة، نجيبة، حمدية

بەڵان له زمانی كوردیدا زۆرترین نێرینه و مێیینان نێوێكی جیاواز و تایبەتییان هەیه وەكو: نازدار، ماین، مریشك

ئامرازی نێرینه و مێیینه:

له زمانی کوردیدا ئامرازی نێرینان ئەوانەیە (نێره، کەڵە، ئێ) وەکو: نێرەکەو، گۆڵەسەگ، ئێ نەخۆشە: هو مریض. ئێ مێیینانیش ئەوانەن (ما، مان، دێڵ، ئا، ێ) وەکو: داکامن، چێلامن، ئێ نەخۆشە، ماکەو، مانگا، دێڵەسەگ.

ناوی سادە، ناوی ئاوێتە:

ناوی سادە (إسم البسيط) تاکە وشەیەکی ڕووتە و بەس وەکو: بەرد، مەرد، کۆتر.

ناوی ئاوێتە (إسم المركب) ناوێکە لە دوو یا لە چەند وشەیەکی پێک بێت وەکو: کۆلکە زێرینە، کاڵەکە – مارانە، سەر – گوێلک.

هەر کاتێکی پارچەی یەکەمی ناوی ئاوێتە بە پیتی بێ دەنگ کۆتایی بێت بە یاریکاریی (ە) یا (ەو) وەیا (او)ەوە دەخرێتە سەر پارچەی دووەمین وەکو: تاتەبەرد، دێڵەسەگ، دارە و دار، ڕەنگاوڕەنگ.

تاک (مفرد)، گەل (جمع):

ناوی تاک ئەوەیە کە تەنیا مرۆڤێک، وەڵسێک، یا چتێکی نیشان بدات وەکو: پیاو، کەو، چرا.

ناوی گەل ئەوەیە کە لە تاکێکی پتر نیشان بدات وەکو: پیاوان، کەرگەل، چرایان، برایێت، خوشکێن.

ئامرازی گەل لە زمانی کوردیدا ئەوانەن:

ئان، یان، گەل، یەل، یێت، یێن، ن.

وەکو: بابان، چرایان، برایەل. گاگەل، پەزێت، چەهڤێن، باڤن (باوکان)، خووەهن (خوشکان).

ناوی تاک بە پیتی بێ دەنگ دوایی بێت بە ئامرازی (ان) دەکرێتە گەل وەکو: ئاسکان، بابان، داران.

بەڵان ناوی تاک کە بە پیتی (أ) یا (و) یا (ی) دوایی بێت بە ئامرازی (یان) دەکرێتە گەل وەکو: برایان، هێرۆیان، دێیان.

هەر ناوێکی پیتی هەرە دوایی (ە) بێ بە (ان) دەکرێتە گەل بەو مەرجە کە پیتی (ە)یەکەی

لێ فڕێ بدرێت وەکو: پەردە، پەردان.

ئامرازی گەل لە خاکی ئەردەلان و لوڕستانیدا: یەل، گەلە، لە زاراوەی بارزان و بادینان و جزیر و بۆتان و هەکاری و سووریە و ئێرەوان و ئارارات و شکاک و عەبدۆیی و جەلالیدا ئامرازی گەل (یێت، یێن، ن)ە.

لە هێندێک شوێناندا (ات، جات، ڕەوە، پۆل)یش بۆ گەل بەکار دەبرێن وەکو: بەهارات، میوەجات، ڕەوە ئەسپ، پۆلە باڵندەیەک.

ئاوەڵناو شێوە، ڕەوش (الصفة):

ئاوەڵناو وشەیەکە شێوەی ناو یا ڕاناوی بنوێنێ وەکو: کوردی ئازا ڕزگاری هەر دەبێ، تۆ کورتی، ئەو درێژە. وشەی (ئازا، کورت، درێژ) شێوەن.

ڕاناو، بەرناڤ (الضمير):

ڕاناو وشەیەکە لە جیاتیی ناوبراو یا ناسراو بەکار دەبرێ تا دووپاتە نەکرێتەوە سا ناوەکە تاک بێ و یا گەل ڕاناو بەسەر (نۆ) بەشاندا دابەش دەکرێت:

١- ڕاناوی کەسی، بەرناڤێن کەسۆک. (الضمائر الشخصية).

٢- ڕاناوی نیشاندان (موور)، بەرناڤێ نیشاندان (ڕبک) (الضمائر الاشارية).

٣- ڕاناوی گەیەنەر، ڕاناوی لێکدەر، بەرناڤێ پێگە (الضمير الموصول).

٤- ڕاناوی نادیار، بەرناڤێ نەپەندی (الضمير المبهم).

٥- ڕاناوی پرسیار (ضمير الإستفهام).

٦- ڕاناوی لەمەڕی، بەرناڤێ ئارزیی (الضمائر التمليكية).

٧- ڕاناوی خۆیی (ضمير النفسي، التوكيد المعنوي).

ڕاناوی کەسی دوو جۆرە:

١- ڕاناوی کەسی جوایەز (ضمير المنفصل) وەکو:

من، مـۆ، ئەز (أنا). تۆ، تو، تە (أنت). ئەو، ویی، ئیی، ڤی (هو). ئێ، هێ، ئە، ڤێ (هی) ئێمە، مە، ئەمە، ئەم (نحن). ئێوە، ئەنگۆ، هۆن، وە (أنتم). ئەوان، وان، ئاذێ (هم، هن).

٢- ڕاناوی کەسیی لکاویش ئەوانەن:

م، ت، ی، مان، تان، یان

ڕاناوی نیشاندان:

بۆ تاکێکی دیار و نزیک: ئەوە، ئەمە، ئەڤە، ئەومتا، ئەومتانێ.

بۆ تاکێکی دیار و دوور: هۆوە، هۆومتا، هۆومتانێ.

ئەوێها (بۆ نێرینانە) ئەواها (بۆ مێیینانە).

بۆ تاکێکی نەدیو (غائب) ئەو، ئەم، ڤی (هو)، ڤێ (هي).

بۆ گەلی دیار و نزیک: ئەوانە، ئەمانە، ئەڤێها.

بۆ گەلی دیار و دوور: هۆوانە، هۆو - وانە.

بۆ گەلی نەدیو: ئەوان، وان، ئەمان.

ڕاناوی لێکدەر، ڕاناوی گەیەنەر، بەرناڤی پێگە (الضمير الموصول):

هەم، ژی، یش، یا، یان، ان، بەلآن، بەلآم، بلا، لێ، بێجگە، جگە، دەنا، بێ لە، بێژ، مەر، مەگەر، هەگەر، ئەگەر، ئەگەرچی، کە، ئاکوو، ئێ کوو، ئەوتۆ، چونکو، چونکە، چونکی، لەورا، لەبەرئەوی... هتد.

ڕاناوی نادیار ( الضمير المبهم):

هیچ، گشت، تێکڕا، هەموو، کابرا، هەرامە، وانێک، هین، یەکێ، یەکێک، کەس، فیسار.

وەکو: هیچی نەهێنا

ڕاناوی پرسیار (ضمير الإستفهام):

ئایا، ئەرێ، هەرێ، داخۆ، داخوا، ئاخۆ، دەبێ، دەشێ، دەبێ وابێ، دەڵێی، بڵێی، ئەڵێی، ئەدی، ئەیی، چیدی، چی دیکە، چی تر، چ، چی، چیە، چییە، بە چی، ما، گەلۆ، کێیە، چۆن، چلۆن، چاوا، کوو، هۆتۆ، ئاوا، بۆ، لۆ، بۆچی، لۆچی، ئەڕای چی، کوو، چرا، کێ، کێ و کێ، کی، کوێندەرێ، کووێڕا، چ زوو، لە کوێ، هاها، کەی، چ کاتێکی، چ چاخێکی، کەینێ، کێها، کیژک، کام، کامە، کوا، کوانێ، کامانە، کامیان، کیژان، کێهایان، چەند، چ قاس، چەن، چەندیان، چما، چمان؟

کیژکی (بۆ نێرینان)، کیژکێ (مێیینانە).

ڕاناوی لەمەڕی، بەرناقێ ئارزی (الضمائر التمليكية) ئەوانی تاک (المفرد) ئەوانەن:

ئی، هی، هینی من (یا) ئی خۆم، یێ من، یێ خوه. (للمذكر) (لي، مالي).

ئی، هی، هینی تۆ (یا) ئی خۆت، یێ تە، (للذكور)، یاتە، یاخوه. (للمؤنث) (لک، مالک).

ئی، هی، هینی وی، ئی خۆی، یێ وی (للمذكر) یاخووه، یاوی (للمؤنث) (له، ماله).

یێ وێ للمذكر، یاوێ (للمؤنث) (لها، مالها).

ئی، هی، هینی ئێمە، ئی خۆمان، یێ مە، یێ خووە، یاخووه، یامە.

ئی، هی، هینی ئێوە، یی، ئی خۆتان، یێ وە، یێ خووە، یاوە، یاخووه.

ئی، هی، هینی وان، ئی خۆیان، یێ وان، یێ خووه.

ئەوانی گەلیش ئەوانەن:

هینەکانی من یا خۆم، یێن من، یێن خووه.

هینەکانی تۆ یا خۆت، یێن تە، یێن خووه.

هینەکانی وی یا خۆی، یێن وی، یێن خووه.

هینەکانی وی یا خۆی، یێن وی (بۆ مێرا)، یێن خووه.

هینەکانی مە (ئێمە) خۆمان، یێن وە (بۆ ئێوە)، یێن ئەنگۆ.

هینەکانی ئێوە ـ ئەنگۆ ـ خۆتان، یێن وە.

هینەکانی وان (ئەوان)، یێن وان، یێن خووه.

ڕاناوی خۆیی ئاوێتە:

خۆم من خۆم، ئەز بخووه، من بخووه، ئێمە خۆمان، ئەم بخووه، مە خۆت (تۆ خۆت)، تە بخووه، خۆتان (ئێوە خۆتان)، ئەنگۆ بۆخۆتان، هۆن بخووه، وە خۆی (ئەو خۆی)، ئەو بخووه، وی بخووه (هو بنفسه)، وێ بخووه (هي بنفسها)، خۆیان (ئەوان خۆیان) وان بخووه.

کردە، کردار، پیشک، فەرمان، کردەوە (فعل).

کردەوە وشەیەکە لە چاوگە (مصدر)ی تێپەڕ و تێنەپەڕ بۆ ئەوە وەردەگیرێ کە لە هەموو کاتێکیدا ئاکار و باری کەسێکی یاچتێکی لە گشت لایەنێکەوە بنوێنێ.

کردەوە لە سێ کاتاندا ڕوودەدات:

١- ئێستا، هەنووکە، نوهۆک (حال).

٢- دواکات، کاتی ڕابردوو، ماند، نەبگردگ (مستقبل).

٣- ڕابردوو بگردگ، بووهێرک (ماضي).

ئێستا (حال) وەکو: دەچم، دێم، دچە، تێ، تێم.

ماند (مستقبل) وەکو: وادەچم، ئەزێ بچم، وادێم، ئەزێ بێم.

ڕابردوو (پێنج) لکی لێک جودای هەیە:

١- ڕابردووی نزیک، بگردگ ڕووت (ماضي، قريب) وەکو: ڕۆیشتم، ئەز چووم. نووسیم، منڤیسی.

٢- ڕابردووی دوور، بگردگ دوور (ماضي بعيد) وەکو: ڕۆیشتبووم (ئەز چووبووم)، نووسی بووم (منڤیسی بوو)

٣- ڕابردووی نەپساو (ماضي استمراري) وەکو: دەڕۆیشتم، دەمنووسی (ئەز دچووم، مدنڤیسی).

٤- ڕابردووی نابەدڵ و پەرۆشی لەدەستچووان (التمني) وەکو: ڕۆیشتبام (ئەز بچووما)، نووسیبام (منڤیسیبا)

٥- ڕابردووی ئاوێتە (ماضي مركب) دوو چەشنە:

١- کرانی فەرمانێک نیشان دەدا کە تەواو ڕابردبێ وەکو: پەڕتووک (کتێب)ەکەم خوێندووەتەوە.

٢- کرانی کارێک نیشان دەدا کە هێشتا نەبڕابێتەوە وەکو: بارام ڕاوەستاوە.

چاوگە ، سەرچاوە، ناوکار، ماکدەر (مصدر).

چاوگە وشەیەکی وایە کە کرداری وی بەندیواریی بەسەر هیچ جۆرە کاتێکەوە نەبێت وەکو: نووسین، خوێندن، بازدان، چاوگە لە زمانی کوردیدا (حەوت) نیشانەی هەیە وەکو:

ان: برژان، دانان، گریان، شێلان، کێلان

ەی: کەردەی، واردەی، بردەی، کوشتەی، گرتەی

تن: کوتن، فرۆشتن، خستن، بەستن، گەزتن

دن: کردن، خواردن، دواندن، گەیاندن، پساندن

ن: کرن، ڤەشارن، هەنارن، برن، خارن

وون: دروون، چوون، هەڵبوون، گروون، جوون

ین: نووسین، چنین، کڕین، ڕنین، دڕین

یان: خوریان، گریان، ئاماسیان

چاوگە دوو چەشنن:

١- چاوگەی تێ نەپەڕ، سالتگر، یەکلا (المصدر اللازم).

٢- چاوگەی تێپەڕ، دەرهنگێف، ناخار (کاری دوولانی) (المصدر المتعدي).

چاوگەی تێ نەپەڕ ئەوەیە کە کارەکەی لە بکەر (فاعل) جوێ نەبێتەوە و پێویستی بە پیشکبەر (مفعول) نەبێ وەکو: چوون، هاتن، دانیشتن، هەستان

چاوگەی تێپەڕ ئەوەیە کە کارەکەی لە بکەر (فاعل)ەوە بۆلای پیشکبەر (مفعول) تێپەڕێ وەکو: گرتن، لابردن

چاوگە دوو جۆرن: تاک، ئاوێتە

چاوگەی تاک وەکو: ڕۆیشتن، دۆشین، گرتن.

چاوگەی ئاوێتە وەکو: هەڵاویژتن، بۆنکردن.

ناوی بکەر، پیشکار (إسم فاعل):

ئامرازی ناویی بکەر ئەوانەی خوارەوەن:

ار: پیشەکار، خوار، کەڤنار، بێدار.

ا: زانا، دانا، خوەندا.

ە: خۆرە، پاڵە.

دە: دڕندە، کڕندە، پەڕندە، گەوەندە.

نۆک: کەنۆک، گرینۆک.

کار: کرێکار، پێشکار، بەکار، سەرکار.

ئێکو: ئێکو هەسپ فرۆت، ئێکو خووەند.

وەر: هونەروەر، بیرەوەر.

گەر: ئاسنگەر، زێڕینگەر.

ور: پەڕەور.

ر: داگر، هەڵگر، وەرگر، دادڕ.

ەر: دانەر، بادەر، بزوێنەر، بیستەر.

وو: نوستوو، دانیشتوو، رابردوو.

ێن: سووتێن، ڕووخێن، وەرێن، خەوێن.

ێنەر: سووتێنەر، رووخێنەر، وەرێنەر، هێنەر.

ناوی بکەر زۆرترینی ئامرازی چاوگەی لێ فڕێ دەدرێ وەکو: خور، دڕ، بڕ، خەف، کەر، کۆش، نووس لە (نانخۆر، بەرگدڕ، داربڕ، کارکەر، فرەکۆش، خۆشنووسی) دا جارجارەش پیتی (ب)ێی لە پێشەوە دەخرێتە سەری وەکو: بخەف، ببڕ، بدڕ، بخوەر، بکوژ، بگر، بکڕ.

ناوی کراو، ناو کریاگ، پیشکبەر (إسم مفعول):

(کراو) ناوێکە کاروبارێکی بەسەر هاتبێ و لە چاوگەی تێ نەپەڕ دروست دەبێ و ئەوانەش نیشانەکانیەتی: او، راو.

هەر کردار (فعل)ێکی کە ئامرازی چاوگەی لێ فڕێ درێ و پیتی هەرە دوایی (ر) یا (ژ) یا (س) بێ (او)ی لە دواوە بخرێتە سەری دەبێتە کراو وەکو: کراو، خوراو، براو، دڕاو، ڕژاو، برژاو، پژاو، هەڵامساو.

بەڵان کردار گەر لە پاش ئامرازی چاوگەی فڕێدرانی بە پیتی (ر) و (ژ) و (س) کۆتایی نەبێت لە زۆر شوێناندا بۆ ناوی کراو (را)ی لە دواوە دەخرێتە پاڵی وەکو:

فرۆشراو، پرسراو، داگیراو، ڕنراو، هەڵکەنراو.

بەڵان لە ئەردەڵان و لوڕستاندا کە کردار ئامرازی چاوگەی لێ فڕێ درێ پیتی (گ)ی لە شوێنی دادەنرێ وەکو: کریاگ، نووسیاگ، دریاگ، خوریاگ.

ڕاخوڕین، فەرمان (الأمر).

ئامرازی ڕاخوڕین ئەوانەی خوارەوەن:

وەکو: بـ، دە، بابـ، دەبـ

بۆ کـەسی تاک وەیا گـەلی دیـار: بچـە، برۆ، برۆن، بدە، بگرە، بـدەن، دە برۆ، دە برۆن، دە بدە، دە بدەن، دە هەڕە.

بۆ کەسی تاک وەیا گەلی نەدیو: بابڕوا، بابڕۆن، بابخوا، دەبابڕوا، دەبابڕۆن

نەهێشـتن (النهي):

ئامرازی نەهێشتن ئەوانەن: مە، نە، یانە، نا، نابێ.

مە: بۆ کەسی دووەمی دیارە سا (تاک) بێ یا (گەل) وەکو: مـەخۆ، مەخۆن، مەڕۆ، مەڕۆن، مەچە

نە: بۆ کـەسی دووەمی دیـارە جـا (تاک) یا (گـەل) بـێ بەدەم هـەڕەشـەوە وەکـو: نـەچی، نەیخۆی، نەیڵێی، نەڕۆی، نەچە

نا: بۆ کەسی یەکەم (ناچم)، بۆ کـەسی دووەم (نـاچی؟)، بۆ کـەسی سـێیـەم: نابی برۆی، نابی برۆن، نابی بڕوا.

نە، بانە، نا، نابی: بۆ کەسی سێیەمینیش بەکار دەبرێن جا تاک بی یا گەل وەکو: نەڕوا، نەڕۆن. بانەنووسێ، بانەنووسن، نا وانییە، ناچێ، نایەوێ.

کردەوە دوو بەشە

١- کردەوەی ناسراو، پیشکێن دیار (فعل معلوم)،

٢- کردەوەی نەدیار، پیشکێن ئاڤزێمکی (فعل مجهول).

کردەوەی دیار (ناسراو) ئەوەیە کە بکەر (فاعل) ئاشکرا و دیار بێ وەکو:

کوردۆ دەخوێنێ، ئازاد دەنووسێ.

کردەوەی ئاڤزێمکی (مجهول) ئەوەیە کە بکەری دیار و ئاشکرا نەبێ وەکو:

نووسران، ڕژان، خوران، دزان.

کرداری یاریکار (فعل مساعد):

کرداری یاریکار بریتییە لە (بوون، کردن) بە یاریکاریی وانەوە زۆرترینی کردار هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرێت و لە گشت چاخێکیدا بۆ هەموو کەسێکی گۆڕینێکی تایبەتییان بەسەر دادێت وەکو: فێربوون، نەرمبوون، کارکردن، تەماشاکردن.

کردەوەی دەستووری و بیستیاری (فعل قیاسي و سماعي):

کردەوەی دەستووری ئەوەیە کە لە کاتی هەڵگێڕ و وەرگێڕیدا لەسەر ڕچەی ڕێزمان و دەستووری دیاریکراو لانەدات و ڕێکوپێک بێت وەکو:

(نووسین) ـ دەنووسێ، نووسی، بنووسە، مەنووسە و... هتد.

هەرچێکوو کردەوەی بیستیاریشە چۆن بیستراوە هەروا بە بێ سەروبەری بەکار دەبرێت وەکو:

(هاتن) ـ دێ، هات، وەرە، بڕۆ و... هتد.

ئامرازی پەیوەندی و پێربەست (أداة الربط):

ئامرازی پەیوەندی کە بۆ نیشاندانی بەندیواریی ناو، ڕاناو یا ئاوەڵناو بە چتێکی ترەوە بەکار دەبرێن ئەوانەن:

یا، یان، ئان، یاخود، یاخۆ، با، بام، کە، کەچی، نەک، چونکو، لەوڕا، تا، هەتا، هەتاکو، بۆ، لۆ، بـ، بە، د، دە، ژ، ژلە، رە، ڕا، ئانکۆ، پاشی، ژبۆ، لە پێش، (لپێش).

(بـ ... وە)، (بە ... دا)، (لە ... دا)، (لە ... وە)، (لە ... ڕا)، لە، پەی، ی، وە، ە، پێ، لێ، تێ، بەڵام، بەڵان، مەگەر، ئەگەر، ئەگەرچی ، هەم، ژیی وەکو: من دەمخوێندەوە بەڵان تۆ نەتهێشت.

ئامرازی بەستنەوە (أداة العطف):

ئامرازی بەستنەوە کە دوو وشە یا دوو ڕستە و ئیتر لێک گرێ دەدەن ئەوانەن:

و، وە، وو (û)

من و تۆ، ئەو پیرۆتی دانا و ڕۆستەمیشی هەڵستاند. دار و بەرد، مار وو مێروو.

نیر، ئاوەڵکردار (الظرف).

نیر دوو جۆرە: نیری چاخی (ظرف الزمان).

نیری شوێنی، نیری لووس (ظرف المكان).

نیری چاخی کاتێک نیشان دەدات کە کرداری تێدا ڕوودابێ و یا ڕوودەدات وەکو: زوو، درەنگ، ئێستا، نوها، کەنگێ، کەینێ، هەینێ، مێژ، لەمێژە، هاوین، پار، پێرار، پێر، پێرێ،

نیوەڕۆ، شەو، سبەی، سبەینێ، دۆ، دوێنێ، ئەمساڵ (ئیساڵ)، تاقل، هێژ، هێشتا، ئیدی، ئیتر، ئەمڕۆ، ئیرۆ.

نیری شوێن، نیری لووس (ظرف المكان).

هۆکاری شوێن جێگایەک نیشان دەدات کە کرداری تێدا ڕوودابێ وەیا ڕوودات وەکو: سەر، ژووروو، ژێر، بن، خوارەوە، پێش، پاش، پشت، تەنیشت، ناو، نێو، هەندوڕ، دوڕ، نێز، نیزیک، دەر، ڤر، ئێرە، ئەوێ.

هێندێک ناویش کە یەکێکیان لەو ئامرازانەی خوارەوە بخرێتە دواوە دەبنە ناوی شوێن (نیریی شوێن) وەکو:

ستان: کوردستان، دارستان، شارستان، گوڵستان، مێرووستان.

دان: قەندان (قەنددان)، خوێدان، شەکردان، ئاگردان.

جاڕ: نێرگسەجاڕ، پێکوڵەجاڕ.

زار: گوڵزار، لالەزار، چیمەنزار

گا: دەستگا، لەشکرگا، سەیرانگا

گە: کارگە، شەڕگە، کێڵگە

ەڵان: بەردەڵان، کەندەڵان، خیزەڵان، بێشەڵان

گازکردن، بانگکردن (النداء):

مرۆ لە کاتی بانگکردن یا کەیفوخۆشی وەیا ناخۆشی و پەرۆش و یان هیوا و ئومێد وە یا ئێش و ئۆف یا لە کاتی واق وڕمان و یا ترسان و کارەساتاندا (گاز)ی بەکار دەبات وە کەرەستەکانی ئەوانەی خوارەوەن: ئا، ئای، ئای ئای، ئاخ، ئەها، ئەرێ، ئەی، ئەی ئەی، ئوف، ئۆی، ئۆی ئۆی، ئۆخەی، ئاه، ەکە، ها، هاها، هەو، وەی، وەی وەی، چش، دەچش، حەست، داخ، پەح، وای، وای وای، داد، بێداد، پەککوو، پەک، هیزە، هۆ، یا، ێ، ئی، هەک، دەک، یاخوا، خۆزگە، بریا، کاشکی، خوەیی، هاهۆ، هەیهۆ، هەلو، گەلۆ، کابرا، برا، کوڕێژگە.

(ە) بۆ بانگکردنە وەکو: بابە، کوڕە.

## پاڵدراو و پاڵپشت (مسند ومسند اليه):

هەموو ڕستەیەک کورت بێ یا درێژ لەسەر دوو بنچینەی پاڵدراو و پاڵپشت دادەمەزرێ.

پاڵپشت: وشەیەکە لە ڕستەدا کە لێی دەدوێین دەبێ ناو یا ڕاناو بێ.

پاڵدراو: وشەیەکە لە ڕستەدا کە بار و چۆنیەتیی پاڵپشت دەنوێنی و دەبێ کردار بێ.

وەکو: کورد ئازاد هەر دەبێ.

## خستنەسەر (إضافة):

ئامرازی خستنەسەر پیتی (ی، یی)یە کە دوو وشە یا دوو بەشان دەخاتە سەر یەکتری وەکو: باوکی ئازاد، قاقەزی چاپخانەی کوردستان، فەرهەنگی مەهاباد، کوردی کوردستان.

## ئامرازی ناسیاری، زێدەر (أداة التعريف):

ئامرازی ناسیاری کە بە دوای وشەی ئاڤزێمکی (مجهول)یەوە دەنووسێن بۆ بە ناسیندانیان ئەوانەن:

کە، ەکە، یە کە

هەر وشەیەکی کە پیتی هەرە دوایەکەی (ە) بی ئامرازی (کە)ی دەخرێتە دواوە وەکو: کۆدەکە، پەردەکە، جەردەکە

هەر وشەیەکی دوا پیتی دەنگدار (ا)، یا (و) یا (وو) یا (ۆ) یا (ی) یا (ێ) بی (یەکە)ی ڕەدوا دەخرێت وەکو:

چرایەکە، دڕووەکە، مرۆیەکە، برییەکە، دێیەکە.

هەر وشەیەکی کە دوا پیتەکەی بێ دەنگ بێ (ەکە)ی لە دواوە ڕەگەڵ دەخرێت وەکو:

بەردەکە، گورگەکە، پیاوەکە.

## ئامرازی نادیار، نەپەندی (أداة المبهم) ئەوانەن:

ێ، یەک، ەک، ێک، ئێک، ئێن، یەکێ، هەر، کەس، کەسەک، کەسێک، توو، هنەک، مرۆ، مرۆڤ، هەموو، هەمی، پڕ، تەنی، هەرکەس، تووکەس، هەمی کەس، فیسار، هەندێ، تۆزێ، برێ، کەمێ، گەلێ، زۆر، مزە، هین، هەرامە، وانێک، یارۆ.

ناوی بچووککار، ناڤێن پچووککار (إسم التصغير):

پچووککار ئامرازێکن بە دوایی هەر ناوێکییەوە بنووسێن گچکەی دەکەنەوە، وەکو:

چە: باخچە، پارچە، کەمانچە، خوانچە.

چک: پنچک، قنچک، سوورێنچک.

چکە: ڕێچکە، گوێچکە، خانووچکە، مێچکە.

کەڵە: سوورکەڵە، ڕەشکەڵە، خڕکەڵە

لە: براله، جۆگەلە، دیزەلە.

ەڵ: پووچەڵ.

ەڵە: گۆزەڵە، دیزەڵە، کووپەڵە.

ۆ: کوڕۆ، شێرۆ.

ۆچکە: ماڵۆچکە، بەربەرۆچکە.

کۆ: شێرکۆ، مێرکۆ.

ۆک: مژۆک.

ۆکە: کەپرۆکە، دارۆکە، باڕۆکە، ئاسنۆکە.

ۆڵە: کیژۆڵە، خوشکۆڵە، خەپەتۆڵە.

ۆلکە: گردۆلکە، تەپۆلکە.

وولکە: داسوولکە، پاچوولکە، ماسوولکە.

ییلە: خڕیلە، کاریلە، تەشیلە، ئەنگوستیلە.

ئامرازی ئاوات (أداة التمني):

بریا، بریان، برێ، بری، بری بەبریی خوای بایە، خۆزیا، خوەزی، خۆزگە، دەک، کاش، کاشکی.

نتک و ڕیکەکان (النقاط والإشارات):

| | |
|---|---|
| . | نتک، نوختە، خاڵ |
| : | جووتخاڵ |
| .. | تەقەڵ |

؟ خاپرس (خاڵی پرس)

! خاواق (خاڵی واق وڕمانێ)، ڕواق (ڕیکی واقمانێ)

! خافەرمان (خاڵی تێڕاخوڕین، ڕفەرمان (ڕیکی فەرمانێ)

( ) کەوانە

« » جووتکەوانە

[ ] کەوانەی گۆشەدار

، بۆر، دابڕ

؛ خابۆر، (خاڵبۆر)، خادابڕ، (خاڵدابڕ)

„ “ چوار بۆر

بۆ ئەو ڕێزمانە تاکتاکە سوودم لە وانەی خوارەوەش وەرگرتووە:

١- LANG KURD یادگاریی دوکتۆر کامران بەدرخانییە.

٢- یادگاریی مامۆستا ڕەشید کوردەی (سووریە).

Rezmana Zimanê Kurmancî

٣- قەواعیدی زمانی کوردی، گرتنی کەلێنێکی تر، مامۆستا نووری عەلی ئەمین.

٤- قواعد اللغة الكردية یادگاریی مامۆستا تەوفیق وەهبی.

٥- فەرهەنگی مەردۆخ یادگاریی شێخ محەمەد مەردۆخی کوردستانی.

٦- ڕێزمانی کوردی هی پۆلی (٥، ٦)ی سەرەتایی.

## تکای تایبەتی

١ـ کە هاتوو واتای هەر وشەیەکی کوردی بەلای هەر هاو زمانێکەوە سەیر وەیا بە پێچەوانەی ئەوەوە بوو کە ئەو دەیزانی سەری سوور نەمێنی و دەمودەست بڕیار نەدا کە هەڵەیە پێویستە لەپێشدا سەرنج بداتە ئەوەی کە فەرهەنگی مەهاباد ئەو ڕاوێژە ناگرێتەوە کە ئەو تێیدا شارەزایە و بەس بگرە زاراوەی زۆرترینی شار و دێهات و تیرە و هۆز و خێڵاتەکانی کوردستانە بۆ وێنە وشەی (ئاوارە) لەلای سۆرانییان کە دەربەدەر و غەریبە بەلاّن لە هەورامانیدا (جوهر)ە.

٢ـ سەرەڕای ئەوانەی سەرەوەش فەرهەنگێکی وا گەورە و گرینک کە خەباتی تاکە

کەسێکی بێت ئومێدی بێ هەڵەیی هەر لێ ناکرێت چونکو بێجگە لە پیری و بێ هێزی نەخۆشی تەوژمی خوێنیشم هەیە کە نەخۆش وا پێویستە خۆی ماندوو نەکات و زۆر بەپێوە ڕانەوەستێ، کەچی من لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا لە شەو و ڕۆژێکیدا ١٦ سەعات پتر کار دەکەم و هەموو ڕۆژێکیش ٨ تا ١٠ سەعاتان تەنیا بەپێوە کاروباری چاپخانە هەڵدەسووڕێنم سەرباریش سەختیی بەڕێچوون و دەست کورتی و بێ یارمەتی و دژیی ڕۆژگارە.

کەوایە هەر کەسێکی هەر جوورە هەڵە و بەسەرچوونێکی لەو فەرهەنگەیدا دەبینی کە بۆمی بنووسی لە لایەکەوە رازەی زمانی خۆی دەکا و لە لایەکی تریشەوە لە کاتی چاپی دووەمیدا بە سوپاسەوە ناویان دەبەم.

# ئا

ئا A: نعم، أجل، حروف التصديق

ئا: للتفجع

ئا: علامة التأنيث في حالة الاضافة مثل: داكا من: والدتي. خوشكا ته: أختك

ئا: الا (حرف التنبيه)

ئا: قبل كل شيء

ئا: ما، أي شيء (ماذا تقول؟)

ئا (ئاغا): سيد، رئيس

ئا: صدقاً؟

ئائا ـ AA: نعم نعم للتأكيد وتستعمل للإستفهام أيضاً

ئابادى Abadî: رسالة، مَكتوب

ئابڕوو Abrû: شرف، عصمة، حياء

ئابڕووچوون: إفتضاح، تهتك

بێ ئابڕوو: قليل الحياء

ئابڕووبران: إفتضاح، تهتك

ئابڕووبراو: مفضوح

ئابڕووبردن: فضح، إنتهاك

ئابڕوودار: شريف، شريفة، مهذب

ئابڕوومەند: شريف، شريفة، مهذب

ئابڕوومەندی: عصمة، وقار، شعور بالكَرامة

ئابۆر Abor: إقتصاد

بە ئابۆر: مقتصد

ئابۆری: إقتصادي

ئابۆریکردن: إقتصاد

ئابۆرزان: عالم الإقتصاد

ئابۆرزانی: الخبرة الإقتصادية

ئابۆریناس: خبير الإقتصاد

ئابۆریناسی: الخبرة الإقتصادية

ئابیدە Abîde: تمثال، هيكل

ئاپ Ap: عم جـ. أعمام

ئاپتەرApter: شيطان، إبليس.

ئاپتەر: مجنون جـ. مجانين

ئاپتەرگە Apterge: دار المجانين

ئاپتەری: شيطنة، فتنة

ئاپتەریکردن: إفساد

ئاپرژێن Apirjên: النضح، رش

ئاپرژێنکردن: رش، رشا

ئاپۆ Apo: عم جـ. أعمام (في حالة النداء)

ئاپۆر Apor: بلاء، أزمة، ضيقة.

ئاپۆر: غريب جـ. غرباء

ئاپۆر: ندوة، مجمع، مؤتمر

ئاپۆر هاڵ: معيشة، ضعيف الأحوال
ئاپۆژن Apojin: زوجة العم
ئاتاج Atac: محتاج
ئاتاجی: حاجة، إحتياج
ئاتە Ate: هاهو، هذا
ئاتەشەک: المرض الأفرنجي (سفليس)
ئاتەشکەدە: معبد النار
ئاتەشخانە: بيت النار
ئاگر Agir: نار
ئاتوون Atûn: جهنم
ئاجوور: طابوق (اللبن المطبوخ)
ئاحێل: كهل
ئاخ Ax: آها، واها، الأسف
ئاخ: تراب، الأرض
ئاخکێشان: تحسر
ئاخا Axa: سيد، رئيس
ئاخافتن Axaftin: محادثة، مكالمة
ئاخاندن Axandin: حشو، شحن
ئاخاوتن: محاورة، مكالمة
ئاخـاوتن: ركـوب الدابة وترويضـهـا بعـد مكث طويل
ئاخایۆک Axayok: صقر صغير
ئاخەبان: أنظر كلمة (گڵەبان)
ئاخەبانو؛ ئاخەبانی: يشماخ، عيبة
ئاخەفتەر Axefter: متكلم
ئاخەفتن: محادثة، مكالمة
ئاخەفتن: خطاب، كلام، نطق
ئاخەفتیار: متكلم
ئاخەڵ: مأوى المواشي في الشتاء
ئاخەلێوە Axelêwe: مارت
ئاخش: أنظر كلمة (ئۆخەی)
ئاخفتن: مكالمة، محادثة

ئاخڤـاندن Axvandin: الإسـتدراج للكلام، فتح جرح او دمل
ئاخگە Axge: عتبة
ئاخڵە Axle: هالة جـ. هالات
ئاخڵەدان: إلتفاف
ئاخلێف: مارت
ئاخلیڤینک: مقلاوة
ئاخنران: إنكباس
ئاخنراو: مَكبوس
ئاخنین Axnîn: كبس، حشو، إدخال بتعسر
ئاخۆ Axo: هل، عجباً؟
ئاخوا: هل، عجباً؟
ئاخوەر: متكلم، قائل
ئاخوەوەند: عالم، متفنن، فاضل
ئاخوەوەندی: تفنن، علم، معرفة، فضل
ئاخـۆتن Axotin: خطاب، نطق، تكلم، مـحـادثة، مكالمة
ئاخۆران: إنقلاب، ثورة، هرج مرج
ئاخۆرە: بق
ئاخوڕ: معلف
ئاخێز Axêz: حركة، نهضة
ئاخێزکردن: قيام. اهتزاز
ئاخێـوتن Axewtin: مكالمة. سـوق بفـتـح السين، انسجام
ئاد Ad: هو
ئادا: جدة
ئاداب Adab: قيح، صديد
ئادان: مفيد، خصيب
ئادانی: فائدة
ئادەم Adem: آدم (أبوالبشر). بشر، رجل.
ئادەمی: بشري
ئادەمیزاد: بشر، ناس، إنسان

ئادەنە Adene: مرآة جـ. مرايا
ئادەی: هيا مع الاستلطاف
ئادگار Adgar: سيما، ملامح. قامة. جـ. قامات
ئادۆدە: معزفة (آلة التعشيب)
ئاذ: هو
ئاذە: هي
ئاذێ: هم، هن، ذا، أولاء
ئار Ar: دقيق، طحين، ليت، لغل، نار
ئار: نار
ئاراڤ Arav: غسالة الصابون
ئارام Aram: صبر، هين، حليم
ئارامگرتن: سكون، قرار
ئارامبوون: سكون، قرار
ئارامکردن: تأمين، تسكين
ئارامگا؛ ئارامگە Aramge: مقر، مثوى، ضريح، قبر جـ. قبور
ئارامی: أمن، هدوء، سَكينة
ئارامیدەر: مُسكّن
بێ ئارامی: حراجة، قلق، إرتباك
ئارامێتی: أمان، سلام
ئاران Aran: بادية، صحراء، رديء، تشجيع، إثارة
ئاراو: غسالة الصابون
ئارەزوو Arezû: شوق، أمل
ئارەزووکردن: إرادة، إشتياق
ئارەزوومەند: راغب، مشتاق
ئارەزوومەندی: إشتياق، رغبة
ئارەق: عرق (مسكَرات)
ئارەق خۆر: مدمن المسكرات
ئارەقە: عرق
ئارەو: عرب
ئارەوی: اللغة العربية
ئارپەشک Arpeşik: زناد البندقية
ئارتوون Artûn: تنور، جهنم
ئارچەن: ذقن جـ. ذقون
ئارد Ard: طحين، دقيق
ئارداف Ardaf: حيلة، كَيد، مَكر، خدعة
ئاردە پێچ: حلوى
ئاردە مشارە: نشارة، نجارة
ئاردەوا: حساء يعمل من الطحين والماء
ئارسم Arsim: زكام، نزلة
ئارڤانە Arvane: ناقة جـ. ناق
ئارگۆن: لون النار، كالنار
ئارگوون: تنور
ئارمانج: غاية، مقصد، هدف
ئارمووش: حرير
ئارنگ: لمعان
ئارۆ Aro: اليوم
ئاروانە: ناقة
ئاروو Arû: خيار
ئارووشک Arûşik: تثائب
ئارهان Arhan: إنكاء، رجوع الالم
ئارهاندن: نَكأ
ئارێ Arê: نعم، أجل
ئارێ: واه، واها
ئارێ ئارێ: نعم نعم
ئاری Arî: مدد، نصر، رماد، عظيم الشأن. العنصر الآري
ئاربیدانک: مزبلة
ئارییش Araiş: عقل، لب، معنى
ئارییشەن: معنويات ذو قوة معنوية
ئاریکار: معاون، مساعد، معين
ئاریکاری: معاونة، مساعدة
ئاڕین: سحق

ئارینەک: محافظة، صیانة
ئارینک: حنك
ئارینۆک: الحمص المجروش
ئازا: باسل، شجاع
ئازاد: حر، مستقل، طليق
ئازادکردن: تحرير، إطلاق، ترخيص
ئازادی: حرية. إستقلال
ئازادیخواز: طالب الحرية
ئازادیخوازی: طلب الحرية
ئازار: ألم، عذاب
ئازارکردن: إيذاء، تكدير
ئازاردان: إيذاء، تكدير
ئازار: طاعون، وباء
ئازاردەر: مؤذي
ئازاردراو، ئازارکراو: معذب
ئازاسەر: مستقل، حر
ئازارسەری: إستقلال، حرية
ئازاڵە: وقود
ئازایی: شجاعة، بسالة، جسارة
ئازەر: نار
ئازما: منقش، منقوش
ئازمووکار: ممتحن
ئازموون: امتحان
ئازوەر: طماع، حريص
ئازوەری: طمع، حرص
ئازووباز: مسؤولية، وبال
ئازووخە: ذخيرة، مؤونة، أرزاق
ئازووشک: تثاؤب
ئازوو گوێزکردن: نقل، مبادلة
ئازین: إسلوب جـ. أساليب
ئاژاوە: فوضى، شغب
ئاژاوەیی: إضطراب
ئاژاوەگێڕ: مشاغب، فوضوي
ئاژەڵ: مواشي
ئاژنینەوە: تخليل
ئاژنینەوەی ددان: تخليل الاسنان
ئاژۆ: تعقيب الاثر
ئاژوەر: سائق السيارة
ئاژۆژ: سائق السيارة
ئاژۆتن: سوق، سياقة، قيادة
ئاسا: مثل
ئاسان: سهل
ئاسانبوون: سهولة
ئاسانکردن: تسهيل
ئاسانی: سهولة
ئاساو: رحى جـ. ارحاء، طاحون
ئاساوان: طحان
ئاسایی: اعتيادي، جواز
ئاسپایی: هدوء
ئاست: اتجاة، جهة
بۆ ئاست: لحضرة، الى حضرة
ئاستانە: عتبة جـ. عتبات
ئاستەم: هدوء. مشكَل، صعب
ئاستەم: ذرة جـ. ذرات
ئاستەبین: مجهر «بكسرالميم»
ئاستن: إهمال، إمهال
ئاسک: غزال، ظبي
ئاسمان: سماء، فلك
ئاسمان و ڕیسمان: كالثرى والثريا
ئاسمانەی دەم: سقف الحلق
ئاسن: حديد
ئاسنجاو: مواعين معدنية
ئاسندڕک: سلك شائك
ئاسنفڕێن: مغناطيس

ئاسنكوت: حداد
ئاسنكێش: مغناطيس
ئاسنگەر: حداد
ئاسۆ: أفق جـ. آفاق
ئاسۆگە: ملتقي الأفق، ظل
ئاسوو: أفق جـ. آفاق
ئاسووگە: مرئي، مشهد. أفق، ظل
ئاسوودە: مستريح، أمين، مطمئن البال
ئاسوودەبوون: إرتياح
ئاسوودەكردن: إراحة
ئاسوودەیی: سكون، إستراحة، أمن
ئاسوێنە: كم (للقميص)
ئاسياو: رحى، طاحونة
ئاسياووان: طحان
ئاسيدە: عجة
ئاسيو: آفة، بليه
ئاش: رحى جـ. ارحاء، طاحونة
ئاشی با: طاحونةهوائية
ئاشی ئاو: طاحونة مائية
ئاشی ئاور: طاحونة نارية
ئاشەڤ: إنقلاب، إضطراب
ئاشەوان: طحان
ئاشە بە تەندوورە: لعبة شعبية، تدبيج
ئاشت: متصالح
ئاشتبوونەوە: مصالحة
ئاشتی: صلح، هدنة، سلام
ئاشقۆرت: ضعيف
ئاشک: (معدة)
ئاشكار: أنظر كلمة (ئاشكرا)
ئاشكرا: جلی، واضح، بديهي، يقين
ئاشكرابوون: ظهور، تبيان
ئاشكراكردن: إعلان، إظهار
ئاشكراكار: مظهر، مبرز، شارح
ئاشكرایی: علانية، بداهة
بە ئاشكرا: جهراً
ئاشنا: خبير، عارف، فهيم، ملم
ئاشنایی: معارفة، صداقة، معرفة
ئاشنایەتی: معارفة، صداقة، معرفة
ئاشوو: خبيث، نجس، دنس
ئاشووپاش: أضغاث وأحلام
ئاشيت: رفاه
ئاشيتی: رفاهية
ئاشيڤكردن: قلع، قمع
ئاشين: دمل جـ. دمائل، خراج
ئاغا: سيد، رئيس
ئاغاژن: سيدة
ئاغاوات: سادات
ئاغايانە: رئيسي
ئاغایەتی: سيادة
ئاغەبانوو: شف (يشماغ الأكراد)
ئاغەڵ: زريبة المواشي
ئاغەڵان: ربع جـ. ربوع
ئاغوو: سم جـ. سموم
ئافەريد: خلق
ئافەريدبوون: تَكون
ئافەريدكردن: إيجاد، تَكوين
ئافەريدە: مخلوق
ئافەرين: أحسنت، (كلمة إستحسان)
ئافەريننده: باري، خالق
ئافتاوە: إبريق
ئافتاوە و لەگەن: إبريق وصحن
ئافتاوی: واضح، ظاهر
ئافتووش: تدخل
ئافر: معلف

ئافرەت: إمرأة، نساء
ئاف: ماء
ئاڤا: أنظر كلمة (ئاوا)
ئاڤا ترش: خل
ئاڤەر: خليج
ئاڤەڤەک: حوض، بركة
ئاڤەند: لياقة، درجة، رتبة
ئاڤدا: أنظر كلمة (هەودا)
ئاڤدار: أنظر كلمة (ئاودار)
ئاڤدان: سقي، إرواء
ئاڤدەست: مرحاض
ئاڤدەستخانە: مرحاض
ئاڤدەنگ: مرقة، (شوربة)
ئاڤدۆنگ: مرقة، رب، عصير الفواكه
ئاڤدين: إنتقام
ئاڤراختن: إغراء، تشجيع
ئاڤروو: شرف، عصمة، حياء
ئاڤرێژ: مرحاض، بيت الخلاء
ئاڤزێل: بركة، حوض
ئاڤزێمكی: مجهول
ئاڤژەن: ملاح
ئاڤژەنی: سباحة، ملاحة
ئاڤس: حبلى، حامل
ئاڤسین: فهم
ئاڤۆر: وعل جـ. وعلات
ئاڤێتن: رمي، قذف
ئاڤی: مائي
ئاڤیژە: ظاهر
ئاڤیژەکرن: إظهار
ئاڤین: خميرة
ئاڤینگ: أنظر كلمة (ئاونگ)
ئاڤید: قبة جـ. قبب

ئاڤیله: محراث
ئاڤیله و ماڤیله: آلات الحراثة
ئاکار: أعمال. أوصاف، شمائل
ئاکام: أجل، منون
ئاگا: نبأ جـ. أنباء
به ئاگا: مطلع
بەئاگاهاتن: تيقظ
ئاگادار: مطلع، خبير، حافظ، متيقظ
ئاگاداربوون: تيقظ
ئاگاداركردن: تلقين، تنبيه، إشعار، إنذار، إعلان، إخبار
ئاگاداری: إطلاع، إشراف
ئاگال: عقال
ئاگانامە: إعلامية
ئاگایی: علم، إطلاع، شهادة
ئاگە: ثم، هناك
ئاگر: نار
ئاگرە: أنظر كلمة (ئاورە)
ئاگربارانە: الويل، الدمار، القصف بالقنابل او بالرصاص
ئاگرباز: المتلاعب بالنار
ئاگرپارە: نابغة
ئاگرپارێز: عبدة النار
ئاگرپەرست: عبدة النار
ئاگرپەرستی: عبادة النار
ئاگرخانە: جهنم
ئاگرخوەش: محبوب
ئاگردان: الموقد. إطلاق النار في السلاح
ئاگرگیرە: شياع، ذكية، وقاد
ئاگردوو: وقود
ئاگرکوژێن: الإطفائية
ئاگرکوژێنەوە: الإطفائية

ئاگرۆکە: أنظر كلمة (ئاورە)
ئاڵ: ضرس، كل، (سنون)
ئاڵ: الأحمر الخفيف، أم الصبيان
ئالآ: علم
ئالآی لەشکر: راية
ئالآهەڵکردن: رفع العلم
ئالآت: توابل، فلفل، بهارات
ئالآدار: حامل الراية
ئالاستن: لحس لحساً، لحس
ئالآن (تێک ئالآن): التفاف، إشتباك
ئالآندن: اللف
ئالآو: ملتف، مشتبك
ئالآ و والآ: أشياء ملونة
ئاڵە: آفة خرافية للاطفال، (أم الصبيان)
ئاڵە: علة في لسان البقر
ئاڵەبێژکردن: التنخيل بالخرفة
ئاڵەت: فلفل (بهارات)
ئاڵقە: حلقة
ئاڵقەرێز: مزلاج، مغلاق
ئالک: أنظر كلمة (ئالیک)
ئاڵکاو: مرتبك
ئاڵگۆن: لون وردي
ئالنگ: لوزتان
ئاڵۆ: خال
ئاڵۆز: متشابك. مختل، غضبان
ئاڵۆزی: إختلال، تشابك
ئاڵۆس: رديء
ئاڵۆسی: ردائة
ئاڵۆسکاو: متشابك
ئاڵۆش: حكة في الجسد
ئاڵۆشە: لحى
ئالو و بۆڵ: حصرم على وشك النضوج
ئاڵوو: لوزتان
ئاڵووکەوتن: إلتهاب اللوزتان
ئالووچە: كرز
ئالوودار: عارضة (عمود). ملتهب اللوزة
ئالووس: جميل. حزن، أسف
ئالووسی: إناقة، حسن، رشاقة
ئاڵوگۆڕ: مبادلة
ئاڵ و والآ: ملون
ئاڵ و والآکردن: تلوين
ئالی: ساحل، شاطيء. جانب، طرف
ئالیک: علف
ئامادە: مهيأ، مستعد
ئامادەبوون: تهيء
ئامادەکردن: إحضار، تهيئة
ئامادەیی: إستعداد
ئاماس: نفخ، ورم
ئاماس، ئاماسیان: إنتفاخ، تورم
ئامان: صحن، وعاء. مجيء. دخيلك (كلمة تطلب بها النجدة)
ئامانەوە: عودة
ئامانج: غاية، مقصد، هدف
ئامان و شیان: التردد ذهاباً وإياباً
ئامبا: رفيق، صاحب
ئامبایی: رفاقة، مصاحبة
ئامپا: رفيق، صاحب
ئامپایی: رفاقة، مصاحبة
ئامتا: رفيق، أقران، صاحب
ئامتایی: رفاقة، قرابة
ئامراز: آلات، أدوات
ئامراز: المشترك في العمل والأمل وغيرها
ئامرازی: المصاحبة في السر
ئامڕایی: مرافقة

ئامسا: جار

ئامسایی: مجاورة

ئامسەر: شريك أو شريكة في الحياة، رفيق، العشير

ئامسەری: رفاقة، شراكة في الحياة

ئامک: عمة، خالة

ئامۆزا: أولاد العم

ئامۆزا ژن: زوجة إبن العم

ئامۆژ: تربية، تعليم

ئامۆژگا: معهد جـ. معاهد

ئامۆژگە: معهد جـ. معاهد

ئامۆژگای زانستی: المعهد العلمي

ئامۆژگار: ناصح، مدرس

ئامۆژگاری: تعليم، نصيحة، وعظ

ئامۆژن: زوجة العم

ئامۆژیار: ناصح. مدرس

ئامۆژیاری: نصيحة. تدريس

ئامودی: رقص

ئاموشۆ: تردد، تزاور

ئامیان: إنفحة

ئامێتە: مزيج

ئامێز: حضن

ئان: أم، أو

ئانە: هو، ذلك، هؤلاء، أما، والا، إما، أو

ئانکو: يعني

ئانگ: شيء

ئانگۆ: وإلا، حينئذ

ئانی: وإلا. جبين

ئانیشا: هم، هن

ئانیشک: مرفق جـ. مرافق

ئاو: ماء. مني

ئاو خواردنەوە: شرب الماء

ئاودان: إرواء

ئاوی دەمدان: تهديد

ئاوا: معمور. كذا، كذلك، أسلوب

ئاوابوون: غروب، أفول

ئاواکردن، ئاواکردنەوە: تعمير

ئاوات: مرام، تمني، دعاء

بە ئاوات گەیشتن: نيل المرام

ئاواتەخواز: متمني

ئاواتەخوازی: تمني

ئاوار: حلوى

ئاوارە: غريب، هائم، تارك الوطن. جوهر، لب، حقيقة

ئاوارەیی: غربة

ئاوازە: لحن، نغمة

ئاوازەخوان: مغني

ئاوازەبێژ: ملحن

ئاوازەبێژی: تلحين، مهنة الغناء

ئاواڵ: رفيق، مؤنس

ئاواڵایەتی: رفاقة، أخوة

ئاواڵدان: مشيمة جـ. مشائم

ئاواڵ زاوا: عديل

ئاواڵ کراس: سروال (للنساء)

ئاواڵ منداڵ: مشيمة جـ. مشائم

ئاوان: هاون، مهراس، خائن جـ. خون و خونة

ئاوانی: خيانة

ئاوایی: قرية جـ. قرى. عمران

ماڵئاوایی: وداع، تحية المودع

ئاوەدان: عامر، معمور

ئاوەدان بوون: عمار

ئاوەدانکردن: تعمير

ئاوەدانی: عمران

ئاوەدز: تفطر الجرح

ئاوەڕ: معلف
ئاوەڕۆ: مجرى
ئاوەڕووت: نتف الريش وزغب الطيـور المذبوحـة بالماء الساخن
ئاوەزێ: نزيز الماء
ئاوەزێڕ: مذهب
ئاوەزێڕکردن: تذهيب
ئاوەزێو: مفضض
ئاوەزێوکردن: تفضيض
ئاوەژوو: مقلوب
ئاوەژووکردن: قلب
ئاوەستێ: كم (للقميص)
ئاوەسۆ: المتغلغل في الشيء. وقح ، عديم الحياء
ئاوەکوڵ: نكبة
ئاوەکی: غريب، ضال
ئاوەگڵ: المتنجس بالكلب
ئاوەگڵ کردن: الغسل بالماء والتراب
ئاوەڵە: مفتوح، مكشوف
ئاوەڵە بوون: إنكشاف
ئاوەڵەکردن: فتح، كشف
ئاوەڵەڕوو: سفور
ئاوەڵدامان: سروال (للنساء)
ئاوەڵکراس: سروال (للنساء)
ئاوەن: هاون
ئاوەنیا: مسقى
ئاویاب: زميل
ئاویابی: زمالة
ئاویارە: ساقية من الخشب أو الحديد
ئاویاز: ملاح، سابح
ئاویازی: سباحة
ئاوبەندی: مـرض داخلـي ينشـأ من (تجـمـع الماء في الجوف).

ئاوپاش: رشاشة، منضخة
ئاوپرژێن: رشاشة، مرشة
ئاوپرژێنکردن: رش
ئاوتا: قرين، نظير
ئاوتایی: تناظر، تماثل
ئاوخۆر: شارب الماء
ئاوخۆرە: قدح
ئاودار: طري، ريان
ئاوداری: نضرة، طراوة
ئاودان: سقي، إرواء
ئاودەر: الساقي
ئاودەست: مرحاض
ئاودەستخانە: مرحاض
ئاودەنگ: أنيس، جليس
ئاودەنگی: أنس
ئاودڕ: خليج جـ. خلجان
ئاودێر: ساقي
ئاور: نار
ئاور تێ بەربوون: إشتعال
ئاور تێ بەردان: إشعال، حرق
ئاور هەڵکردن: إشعال، إيقاد
ئاوری بن کایە: (مفتن، مفسد)
ئاور هەڵکەر: مشعل
ئاوڕ: إلتفات، لفت
ئاوڕ لێدانەوە: عطف، رعاية، ملاحظة
ئاورا: جائع
ئاورایی: جوع
ئاورە: قوباء
ئاورپەرست: عباد النار
ئاورپەرستی: عبادة النار
ئاوڕدانەوە: إلتفاف. عطف، مساعدة
ئاوردوو: وقود

ئاوڕژتن: سكب الماء، نضخ الماء

ئاوڕژێن: ساكب، ناضخ

ئاوڕژێن كردن: رش. رشا

ئاورنگ: إلتهاب الغدة اللمفاوية نتيجة إنجراح
أحد الأعضاء تأثير. لمعة

ئاوڕوو: حياء، عصمة

ئاوڕێژ: شلالة، مجرى

ئاوڕێژگە: مصب

ئاوریشم: حرير

ئاوریشم فرۆش: قزاز

ئاوڕیش بوون: تعرض، تحرش

ئاورین: ناري

ئاورینگ: أنظر كلمة (ئاورنگ)

ئاوزا: قرين جـ. أقران، رفيق

ئاوزە: قرين جـ. أقران، رفيق

ئاوزەنگی: ركاب جـ. ركب

ئاوزێ: أقران، أتراب

ئاوزینگ: نزع، إحتضار

ئاوس: حبلى

ئاوسان: إنتفاخ

ئاوساو: المتورم

ئاوسەرکەم: محتاج، فقير

ئاوسەرکەمی: إحتياج، فقر

ئاوسێ: جار

ئاوف: تأوه

ئاوکێش: سقاء

ئاوگیر: مستنقع

ئاوگیربوون: إستنقاع

ئاولاوی: مجدر، مجدور

ئاوڵە: جدري

ئاولک: نفاطة

ئاوماڵ: جار، جبران. غثاء

ئاوماڵک: الغثاء المرمى في مسائل مياه الأمطار

ئاونگ: هاون. ندى جـ. أنداء

ئاو و ئاو چی: كلمة دعاء الشر مثل بئس المصير

ئاووهەوا: مناخ

ئاویار: ساقي، مسقي

ئاویاری: سقي

ئاوێتە: مزيج، ممزوج، مخلوط، مركب

ئاوێژە: رامي، قاذف

ئاوێژەر: رامي، قاذف

ئاوێژیار: رامي، قاذف

ئاوێستا: كتاب باللغة الكردية للمفكر (زردشت)
تحتوي على الحِكَمْ والنصيحة السامية
للحياة

ئاوێنە: مرآة جـ. مرايا

ئاوێنەبەند: الغرفة المزدانة بالمرايا

ئاویە: مسقى، سقى

ئاوی: مائي. مسقى، الحيوانات المائية

ئاویپرژ: شلالة

ئاوی چاودان: تخويف

ئاوی دەمدان: تخويف

ئاوی ڕوو: حياء

ئاوی زار: لعاب، ريق

ئاوی زاردان: تخويف

ئاویژە: الاراضي المستسقية

ئاویژتن: رمي، قذف

ئاویلکە: نزع، الحشرجة

ئاوینەک: ورع، تقوى

ئاە: واهاً (كلمة تحسر)

ئاها: إنتبه. واهاً

ئاهاء: هاها (للحيرة)

ئاهەنگ: طرب، عشرة، قصيدة، عزم، نغمة، لحن

ئاهەنگی موزیقە: لحن الموسيقى

ئاهەنگدار: مطرب

ئاه و ناڵه: أنين

ئاهۆ: علة، صرع. جنون، طاعون، وباء

ئاهێر: نار

ئاهێن: حزن، كدر، كآبة

ئاهی سارد: يأس

ئای: تستعمل حين التردد والتعجب وي، ويح.

اذ، إذن، وا، وي، ويلك كلمة التأسف

ئایا: هل، هلا؟ (في الاستفهام)

ئای ئای: نوع خاص من الالحان الكردية

ئایه: ربح

ئایەر: نار

ئایرۆ: وي

ئایل: طفل، صبي

ئاین: قاعدة، قانون، رسم. دين، مذهب

بێ ئاین: ملحد

ئایندار: متدين

ئاینداری: تدين

ئاینده: مستقبل

ئاینڕا: شرع، شريعة

ئاینی: مذهبي، ديني، روحاني، إحتفال ديني

ئایهۆ: كلمة تدل على عدم الرضى

ئایسان: إشتعال

ئایساندن: إشعال

ئایساو: مشعول

# ئە E

ئە: الحرف الثاني من حروف الكردية الهجائية، تستعمل للتأنيث، أداة المستقبل تلحق اوائل الافعال

ئە ئاوەدانە لە زگی خۆیدا: هي ذكية

ئەئاوا: هكذا

ئەئەوە: ذا جـ. اولاء، ذي و هذي للتأنيث

ئەئۆ: كلمة تقال في سوق الحيوانات

ئەئێرانە: هەنا

ئەئێرە: هەنا

ئەبابۆز: حرامي، سارق، لص. سريع

ئەبابۆزی: سرقة، سرعة

ئەبلەق: أبلق

ئەودالّ: هائم، عاشق، مغرم

ئەودالّی: عشق، هيام

ئەبێ: يجب، ينبغي، يصير

ئەترەش: معنويات. جرئة

ئەترەش چوون: إرتعاب

ئەتک: هتك، فضيحة، تعرض

ئەتککردن: إفضاح

ئەتککراو: مفضوح

ئەتۆ: أنت

ئەتوون: جهنم

ئەجکاندن: إفناء، إمحاء، إبادة

ئەجکین: إضمحلال

ئەچ: مِنْ (بكسر الميم)

ئەچێگە: هەنا

ئەختەر: نجم، كوكب

ئەختەرژمێر: منجم

ئەخشالّ: أثاث البيت

ئەدا: سلوك، خصلة، شميلة

ئەدی: أجل

ئەدی چ دەڵێی: فماذا تقول؟

ئەددی: تستعمل للحيرة. أجل

ئەدی نا؟: اليس؟

ئەذا: أم جـ. أمهات

ئەر: إذا (للاندهاش والتعجب)

ئەڕا: الى، لأجل. منشار

ئەڕاچووێ: لم، لماذا؟

ئەراکێل: جاسوس. حائر

ئەرانە: خزام

ئەراوەند: مرتفع

ئەڕای چی: لماذا؟

ئەڕەبەستە: ذبيحة، أكولة، ربيطة

ئەڕەنەڕ: نهيق

ئەرەج: زند
ئەڕەچی: شباهة
ئەرەحیا: کان، کأنه
ئەرەنیای: وضع
ئەرەنیشتەی: جلوس
ئەرەو وستەی: غلق الباب
ئەربووث: أشقر اللون
ئەرباب: صاحب، ندیم
ئەرپێڤانی: مسح الأرض
ئەرخاندن: أعیاء
ئەرخەوان: أرجوان
ئەرخەیان: مطمئن
ئەرخەیانی: إطمئنان
ئەرخین: تعب، کلل
ئەرد: أرض
ئەردنیگاری: جغرافیا
ئەردزین: معدن، فلز
ئەرزینگ: ذقن جـ. ذقون
ئەردی: عمامة
ئەرز: أرض
ئەرزان: رخیص
ئەرزن: دخن
ئەرزێل: منضدة
ئەرژەنگ: غول، عفریت
ئەرڤاز: تلعة جـ. تلع
ئەرک: وظیفة جـ. وظائف. تعب، مشقة. کلفة. دارالحکومة، بلاط
ئەرک کێشان: ممارسة. مکابدة
ئەرگ: موقد
ئەرمین: جدي (نجم)
ئەڕن: تمرد، بغض
ئەرناڤ: بغض، حقد
ئەرنۆ: حاقد، حقود
ئەرنیگاری: جغرافیا
ئەرنین: حرد
ئەرومند: کید، حیلة، غش
ئەرێ: أ، هل، نعم، أجل
ئەرین: زئیر الاسد
ئەرینی: ذراع. زئیر الاسد
ئەز: أنا
ئەزبە: حب جـ. حبوب (کبسول)
ئەزبەنی: خادمکم، داعیکم
ئەزمان: لسان جـ. السنة. سماء
ئەزمان ڕەش: هماز (بتشدید المیم)
ئەزمانی: سماوي
ئەزموون: إمتحان، إختبار
ئەزمین: قطب (نجم). هماز
ئەزوا: صبر (دواء)
ئەزێچ: منة
ئەژ: من، عن
ئەژدەر: أفعی، تنین
ئەژدەهار: أفعی، تنین
ئەژدیها: أفعی، تنین
ئەژمار: حساب
بێ ئەژمار: غیر محدود
ئەژمارە: عدد جـ. أعداد
ئەژماردە: منتخب
ئەژماردن: أحصاء، تعداد
بۆ ئەژماردن: غرامة
پێ ئەژماردن: تغریم
ئەژمەت: إضطرار
ئەژمێر: محاسب، حاسب
ئەژمێرراو: محسوب، معدود
ئەژنەڤتن: سماع
ئەژنەوین: سماع
ئەژنۆ: رکبة

